حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە ((٦))

# مێژووی کتێبخانەکانی سلێمانی

## ١٩٠٠ - ١٩٧٠

مارف ناسراو

٢٠٠٠

لەبڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاکردنەوە ((زنجیرە ٦)) / ٢٠٠٠

ناوی کتێب : مێژووی کتێبخانەکانی سلێمانی
بابەت : مێژوو
ناوی نووسەر : مارف ناسراو
کۆمپیوتەر : شادان ئەحمەد / وەزارەتی ڕۆشنبیری
مونتاژو بەرگ : بێستون فەرهاد
چاپ : چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری
چاپی بەرگ : چاپخانەی هەواڵ
تیراژ : ٥٠٠ دانە

ژمارەی سپاردنی ((١٢١)) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری ساڵی ٢٠٠٠ی دراوەتێ

نرخی (١٠) دینارە

## دیاری وەزارەتی ڕۆشنبیری بۆ ڕۆشنبیران
## لەیادی ((١٠٢)) ساڵەی ڕۆژنامەگەری کوردیدا ...

بـواری ڕۆشـنبیری لەکۆمـەڵگادا گرنگییـەکی وای هەیـە کـ
پێویسـتی بەخزمـەتکردن و لالێکردنـەوە هەیـە .. ڕاسـتە کۆمـەڵ
کـوردەواری وەك زۆر لـەوڵاتانی تـری دواکـەتوو و لـەکاروان بـەج
لەهەموو بوارەکاندا پێویستییەکی زۆری بەئاوڕلێدانەوەو بەگەڕخس
هـەموو تواناکانـە بـۆ کورتکردنـەوەی مـەودای دواکـەتوویی لـەکارو
گـەلانی جیـهان لـەڕەوتی مێژووییـدا ، بـەڵام بـواری ڕۆشـنبیری زی
لەبوارەکانی تر پێویستی بەلالێکردنەوە هەیە ، چونکە وەك نووسەر
بەناوبانگی جیهانی دەڵێت: ((مرۆڤ تەنها بەنان ناژی)) و تا لەم بوار
هەنگاوی یەك لەدوایەك نەنرێت، کۆمـەڵگای ئێمـە هەروا بەدواکەوتو
دەمێنێتەوە.. میللەتانی تر تەنانەت دراوسێکانمان زۆر زووتر هەس
بـەگرنگی ئـەو بـوارە کـردووەو هـەنگاویان هەڵهێناوەتـەوە . نەتـە
ئەرمەن زیاتر لەسێسەد ساڵ پێش ئێمە کەوتوون لەو بوارەدا.

ئێمەی کورد بەهۆی نـەبوونی قەوارەیـەکی سیاسـی و دابەشبو
وڵاتەکەمانـەوە ، زۆر درەنـگ کەوتوینەتـە خۆمـان و لەگـەڵ ئەوەش
دڵسۆزان و خەمخۆران پێش سەد ساڵێك ئەو ڕێگایەیان گرتووەتە ب
یەکـەم هـەنگاویان نـاوە ، خـێزانی ((بەدرخانییـەکان)) پێشـەنگی ئ
کاروانـە بـوون و لـە ((٢٢ /٤ / ١٨٩٨)) دا یەکـەم ژمـارەی ڕۆژنام
((کوردسـتان))یـان بڵاوکردووتـەوەو تائێستا ئـەو کاروانە لەگەڵ هـە
هەورازو نشێویی و ئەرك و ئازارو دڕك و دالێکدا هەر بەردەوامە لـەبڕ
ئەو ڕێگا دوورو درێژەدا.

وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان ، بەپێی بەرنامەیەکی داڕێژراو، گرنگییەکی زۆری داوە بە بواری ڕۆشنبیری کەلتووری و فەرهەنگی و .. هتد ، بەگوێرەی توانا دەسگرۆیی نووسەران و ڕۆشنبیرانی کردووە و دریغی نەکردووە لەچاپکردن کۆمەك و یارمەتیدانی ڕۆشنبیران.

لەیادی سەدو دووساڵەی ڕۆژی ڕۆژنامەگەری کوردیدا بەڕێوەبەرایەتییەکەمان بەنەوازشەوە هەشت بەرهەمی ڕۆشنبیران نووسەرانی کوردی کردووە بەدیاری ئەو ڕۆژە پیرۆزو مێژووییە بەئومێدی دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی.

سوپاسیشمان بۆ چاپخانەی ((هەواڵ)) لە سلێمانی ، کەلەکار چاپگەریدا هاوکاری دڵسۆزانەیان کردین.

**بەڕێوەبەرێتی گشتی**
**چاپ و بڵاوکردنەوە**
**٢٢ / ٤ / ٢٠٠٠**

22/4/1898
22/4/2000
یادی سەدو دووساڵەی ڕۆژنامەگەری کوردی

## پێشکەشە بە گیانی نەمران:

- پیرەمێرد
- عەبدوڵڵا جەوهەر
- کاکەی فەللاح
- مەحمود خاکی

# پێشەکیەکی پێویست

ئاشکرایە مێژووی دەست پێکردنی نووسین و تۆمارکردن و هەڵکۆڵین لەسەر بەردو پاشانیش لەسەر پێستە. خۆی بۆ خۆی مێژوویەکی دێرینی هەزاران ساڵ لەمەوبەری هەیە . بە سەدان بڕوانامەو دکتۆرا لە دانشگا بەرزەکانی دنیا لەسەری وەرگیراوە . بۆ هەموو کارێك مرۆڤ کە پێی هەڵدەستێ ، وزەو تواناو ئەرك و ماندوو بونی ئەوێ .. ئەمە ئیتر بیرکردنەوە بێ یا کارکردن بۆ هەر شتێك مرۆڤ بیەوێ بیکات.

بە چاوخشاندنێك بە مێژووی هەرە کۆن و دێرینی مرۆڤ لە چاخەکانی زووەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە چۆن گەیشتۆتە دۆزینەوەی پێویستیەکانی ژیانی رۆژانەیان ، هەروەها زۆر شتی زانراوی وەك نووسین لەسەر بەردو هەڵکۆڵینی تا گەیشتە دۆزینەوەی چاپ .

"چا پێش مێژووی تایبەتی خۆی هەیە یەکێك لە ئەنجامە هەرە گرنگەکانی پەیدابوونی نووسین و دانانی کتێبە لەوەتەی نووسین پەیدابووەو ئادەمیزاد دەستی کردوە بە هەنگاونانی گەورە لە مەیدانی بەرەو پێش چوونی شارستانەتیدا ، کتێب بۆتە ڕوی هەرەگرنگ و بزوێنەری هەرە پێویستی ئەو بەرەو پێش چوونە . لە سەردەمی ئاشوورییەکانەوە کتێب و کتێبخانە پەیدا بوون . کتێبی ئەو سەردەمە بە بارست گەورەو بە سەنگ قورس و بە ناوەرۆك بچوك بون — یەکێك چەند قەنێك دەبوو ؛ گواستنەوەی چەند گالیسکایەکی دەویست ، کەچی خوێندنەوەی بەحونجە لەوانەبوو تاقەسەعاتێك نەخایەنێ — لەم دواییەشدا کار گەیشت بەوەی دوودانەکتێبی چەند صەدلاپەڕەیی بەئاسانی لەپاکەتە قەقارتەیەکدا جێگەیان بێتەوە "[1]

هەربۆ بەرزی کتێب و کتێبخانە دەگەڕێنەوە سەر ئەو ڕاپۆرتەی کە زانای بەناوبانگ خوالێخۆشبوو شێخ محەمەدی خاڵ دەربارەی نامەخانەو

کتێب و دەستنوس دەڵێت :"لای میسری و هیندی و چینییەکان کتێب لە پەرستگاکاندا دادەنراو بە شتێکی پیرۆزو موفەرکیان دەزانی — رەمسیس — ی گەورە کە یەکێك بوو لە فرعەونەکانی میسر زۆر کتێبی خۆشویستوەو کۆی کردۆتەوە لە کۆشکەکەی خۆیداو خستونیە ژێر چاودێری دوو خوای خۆیان — تووت — و سافرێن" [٢] بەمەدا ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە دامەزراندنی کتێبخانە دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ پێش عیسا بەلام ئەوسا دەسەلاتدارو پاشاکان وەك کتێبخانەی تایبەتی خۆیان لە کۆشکەکانیادا دەستیان بەسەردا گرتوون ، سەبارەت بە کتێبخانەی گشتیش کە هەموو کەس بتوانێ هاتوچۆی بکا هەر جەنابی شێخ محەمەدی خاڵ لەو راپورتەداو لە شوێنێکی تر دەڵێت :"لە کۆتایی سەدەی سێیەمی پێش زایینیدا کە "پییرغام" کتێبخانەیەکی گەورەی گشتی بەناوبانگی دامەزراندو پاشانیش گواستیانەوە بۆ ئەسکەندەرییە ئەم کتێبخانەیە بۆ هەموو کەسێك هەبوو بچێتە ناوی و بگەڕێ و تەماشای هەموو ئەو نووسراوانە بکاو بیان خوێنێتەوە." [٣]

زانیمان مێژووی کتێبخانەی تایبەتی و کتێبخانەی گشتی لە دنیادا دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ لەمەوبەر.

لە کوردستانیش بەر لە هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەیان بگرە سەدان پەرستگاو شوێنی تایبەتی هەبوو بۆ پاراستنی ئەو نوسراوانەی تیایاندا کۆکرابوونەوە ، لە هەندێ سەرچاوەدا باس لەوە کراوە ئەو پەرستگاو شوێنانە کاول و وێران کراون هەرچی تیادا بووە سوتێنراوەو فەوتاون پاشان جارێکی ترو بە شێوەیەکی تر دەستکرایەوە بە کۆکردنەوەی سەر لە نوێ دەستنوس و نوسراو لەتەك ئەمانەشدا ئەمجارە قورئانی پیرۆزو هەمو جۆرە نوسراوێکی دینی کە پیرۆزی ئیسلام لە ناوچەکەدا بلاو بکاتەوە بەناو خەلکا .

لەو دەمەدا شارەزوور لە بناری شاخەکانی خورماڵەوە تا عەربەت یەکێك بووە لە شارە گەورەکانی ئەوسای ئەو قەڵەمڕەوە بە دەیان پیاوی زاناو دانای تیادا هەڵکەوتوە بڕوانە (معجم البلدان) ە کەی یاقووتی حەمەوی بەرگی پێنجەم لاپەڕە (٢١٤) چاپی یەکەم ، کە چۆن باس لە زانایان و گەورە پیاوانی ئیمانداری ئیسلامی کورد ئەکا. . . بەڵێ کوردستان دەیان کتێبخانەی گەورەو دەوڵەمەندی تیادا بوە ماوۆستا مەلا مەحمود ئەحمەد محەمەد لەو بارەوە دەڵێ کە : "بەگوێرەی سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو — نۆسەد ساڵ لەمەوبەر کتێبخانەی شاری دیاربەکر ژمارەی کتێبەکانی گەیشتۆتە ملیۆنێك و چل هەزار کتێبی دەستنوس "[٤] تا ئەو کاتەی تاتارو مەغۆلەکان نەهاتبوونە سەر کوردستان و وێرانیان نەکردبوو لە زۆر شارو شارۆچکەو دێ و کوێرە دێیەکیشا کتێبخانەی تیادا بوە ، بەڵام کە هێرشی وێرانکاری ئەوان هاتن هەموویان سووتاندو فەوتانیانن ، بۆیە جارێکی تر دیسانەوە میرانی بابان کەوتنەوە خۆ بۆ دۆوستکردنەوەی خوێندنگاو کتێبخانە لە قەڵەمڕەودکەیاندا "بایەخێکی یەکجار زۆریان داوە بە کردنەوەی خوێندنگاو کتێبخانەو پەرەپێدانی خوێندەواری بە تایبەت لەسەردەمی سلێمان پاشادا (١٧٥٠ — ١٧٥١) کە بە دەوری زێڕین ناو دەبرێ . کتێبخانە گەورەکەی قەڵاچوالان لەگەڵ خوێندنگا کە گوێزرایەوە بۆ مزگەوتی گەورە خوالێخۆشبوو ماموستا محەمەد قزڵجی ئەڵێت :"پێکهاتبوو لە چەند ژورێگ بۆ ماموستاو فەقێ یەکان ژوورێکی گەورەش تەرخان کرابوو بۆ کتێبخانەکەی[٥].

کە چاپخانەش هاتە رۆژهەڵاتەوە هەروەها بەئاسانی نەئەتوانرا کتێب و دەستنوس و بەڵگەنامەکان چاپ بکرێن ، چونکەلەسەرەتاوە سوڵتانەکانی عوسمانی زۆر ئەترسان وسڵیان ئەکردوە بەتایبەت لەوڵاتە موسڵمانەکاندا تا "کارلەوەش تێپەڕی سوڵتانەکان چاپ کردنی کتێبیان بەکفر دادەنا

بەتایبەت کتێبی ئایینی . هەندێك سەرچاوەی تورکی باسی ئەوە دەکەن چۆن سولتان محەمەدی چوارەم — ١٦٤٨ —١٦٨٧ فەرمانی داوەهەموو ئەو قورئانانەی کابرایەکی ئەوروپایی بە چاپکراوی لەگەڵ خۆی هێناونیە ئەستەموڵ تورِ بدرێتە ناو دەریاوە، هەر بە فەرمانی ئەویش ئەو پیتە عەرەبییانەی بە دیاری لە ڤینیسییاوە بۆیان نارد فڕێ دراونەتە ناو دەریاوە.(٦)

ساڵی ١٧٨٤ ز کە شاری سلێمانی دروست کرا تەنیا گوندێك کە ناوی مەلکەندی بوو خوێندنگایەکی بچووکی تیادابو ، بەلام بە گواستنەوەی ئەو خوێندنگا گەورەیەی قەلا چوالان و کتێبخانە دەوڵەمەندەکەی بۆ ناو شاری سلێمانی دروست کردنی هەردوو قەیسەری نەقیب و وەسمان پاشاو چەندین خانی گەورەی بازرگانی سلێمانی لە زۆر ڕوی ژیانەوە پێشکەوت ، کتێبخانە گەورە دەوڵەمەندەکەی مزگەوتی گەورە بەناوی کتێبخانەی بابانەکان ناونرا.

"لەساڵی ١٩١٩ نزیکەی شەش هەزار کتێبی زۆر بە نرخ لەو کتێبخانەیەدا کۆبووبۆوە ، بەلام لە دوای کارەساتی بەدیل گرتنی "شێخ مەحمودی نەمر" لە دەربەندی بازیان و هاتنی ئینگلیزەکان بۆ سلێمانی ، هەرچی کتێبێ لەم کتێبخانەیە دابوو هەموویان هێناو لە حەوشەی مزگەوتی گەورەدا سوتاندیان دوکەڵ و خوڵەمیش هەموو ناوچەکەی گرتەوەو زور بە داخەوە کە ئەم گەنجینەیە لەناو چو تەنیا نزیکەی (٤٠٠) کتێبێك مابۆوە کە ئەویش ئێستا زۆریان لە کتێبخانەکەی ئەوقافی سلێمانیان (٧) دیسانەوە لە ساڵانی جەنگی جیهانی یەکەم بەر لە هاتنی ئینگلیز بۆ سلێمانی مامۆستا مەلا مەحمود ئەحمەد ئەڵێت :"خزمانی کاك ئەحمەدی شێخ ئەم کتێبانەیان دابەش کرد بەسەر خۆیانداو هەر کتێبێك بەرگ و دیمەنی جوان بوو بردیانەوە بۆ ماڵی خۆیان بۆ ئەوەی ، بیان پارێزن لە دزی و دەست درێژی کۆمەڵێکیش لەو کتێبانە هەر لە مزگەوتی

گەورە مانەوە: ئەو کتێبانەی رزگار بوون لە حوجرەیەکی بێ دەرگاو پەنجەرەی شڕو وێران تۆزو خۆڵیان لێ نیشتبو تا خوا لێخۆشبوو زانای دڵسۆزمان شێخ محەمەدی خاڵ ساڵی ١٩٤٥ لیژنەیەکی بۆ دروست کردو سەرژمێرو لیستیان بۆ کردو هەموویان خستە ناو چەند دۆلابێکی دارەوە تا ساڵی ١٩٧٩ وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزی دامەزراندو ئەو کتێبانەی گواستەوە بۆ ئەو کتێبخانەیە.(٨)

زۆرجار کە باس و خواسی مێژووی شاری سلێمانی ئەهاتە باس کردن باوکم ئەی ووت: "تەمەنم دوانزە سیانزە ساڵ بوو زۆر چاك لە بیرمە کە ئینگلیز هاتنە سلێمانی سوارەکانی شێخ هەڵاتبون بۆ شاخ ئیتر ئینگلیزەکان لە تۆڵەی ئەوەدا ئەکەوتنە گەڕان بە دوای ئەوماڵانەدا کە لەگەڵ شێخ دا چووبوونە شاخ و هەرچی کەلوپەل و ناو ماڵیان هەبوو هەموویان تاڵان کردو هێنایانە بەردەم دەرگای مزگەوتی گەورەو ئاگریان تێ بەرداو سووتاندنیان.(٩)

بەم ئاوڕدانەوە مێژووییە کورتەی دامەزراندن و پەیدابوونی کتێبخانە لە دنیاداو لە کوردستان بە گشتی و لەشاری سلێمانی بە تایبەتی کە بۆ یەکەمجار کتێبخانەی تیا دامەزرابێ ئەو کتێبخانە گەورەیەی قەڵاچوالان بوو کە لە دوای دروست کردنی سلێمانی گوێزرایەوە بۆ مزگەوتی گەورە لەگەڵ چەند خوێندنگایەکی تر . یەکەم ماموستا لەم مەدرەسەیەدا دەرسی ئەوتەوە زانای بەناوبانگ شێخ مارفی نۆ دێ بوو هەر خۆشی سەرپەرشتی ئەو کتێبخانەیەی کردووە میرانی بابان لە یارمەتی دان و بەرەو پێش بردنی ئەم کتێبخانەیە درێغیان نەکردوە ، بگرە زێتر بایەخیان پێداوە ، تەنانەت زۆر جار "خەڵکیان ناردوە بۆ پایتەخت و شارە گرنگەکانی ئەو رۆژگارە بە مەبەستی کڕین و نوسینەوەی دەستنوسی نایاب و پڕ بایەخ بۆ کتێبخانەکە . چەرچی و پیاوانی نێراوی ئەمان شارەکانی

بەغداو موسڵ و ئەستەمبوڵ و وان و مەککەو مەدینەو قاهیرەو دیاربەکر و یەمەن و چەندین شوێنی تر گەڕاون و پشکنیویانن بۆ بەدەست هێنانی دەستنوسی نایاب و بێ وێنە بۆ ئەم کتێبخانەیە گەورە پیرۆزەی سلێمانی (١٠)

بە مەبەستی ئاوڕدانەوە لە مێژووی کتێبخانەکانی شاری سلێمانی لە ساڵی ١٩٠٠ تا ١٩٧٠ دەستم دایە گەڵاڵە کردن و ئامادەکردنی ئەم نامیلکەیەو بە پێی توانا دەستم کرد بە سۆراخ و گەڕان و پشکنینی لاپەڕە کۆنەکانی ئەو چاپکراوو رۆژنامەو گۆڤارانەی ئەوسا دەرچوون و چاوپێکەوتن لەگەڵ زۆر کەس لەوانەی خاوەنی کتێبخانە بوون و ئەو بەڕێزانەش کە جێی متمانەو گێڕانەوەی مێژووی نزیکی شارەکەمانن و لە ژیاندا ماون.

ئەم دیارییە خنجیلانەیەم پێشکەش کرد بە کتێبخانەی شارە خۆشەویستەکەم . داواشم لە ئێوەی خوێندەوارانی خۆشەویست ئەوەیە کە هەرچی پێ بزانن لە زانیاری زیاترو ئەو کەم و کورتیانەی بەر چاوتان ئەکەوێ لەم نامیلکەیەدا بە نوسین ئاگادارم بکەنەوە تا ئەگەر هەلێکی تر رەخسا بۆ لە چاپدانەوەی ئەو زانیاریانە لەبەرچاو بگیرێن و ناتەواوییەکان ڕاست بکرێتەوە ، لەگەڵ داوای لێبوردن لەسەر کەم و کورپیەك.

**مارف ناسراو**

سلێمانی

١٩٩٩/٣/٢٧

# ١- کتێبخانەی مەلا عەلی سەحاف

## کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم

مەلا عەلی سەحاف لە سییەکاندا

کتێبخانەی مەلا عەلی سەحاف کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم دامەزراوەو بەناوی مەلا عەلی سەحافەوە بەناوبانگە بە تایبەت لە بەرگ تێگرتن و شیرازەو جزو بەندکردنی کتێبدا شارەزاییەکی تەواو و بێ وێنەیان هەیە ، ئەمەش هەر لە باپیریانەوە کە مەلا برایمی قولە ڕەشی یە وەك ئەگێڕنەوە" لە هەموو قەڵەمڕەوی بابان و ئەردەلاندا کەسێك نەبوە بە وێنەی مەلا برایم شارەزاو لێهاتوو بە سەلیقە بووبێ لە شیرازەو جزو بەندو بەرگ

تێگرتنی کتێبدا بە جوانترین شێوە "[١١] هەر هەموو ئەو کتێب و دەست نوس و کەشکۆڵ و قورئانانەی کە پاشای بابان دەیناردن بۆ جزو بەندو بەرگ تێگرتن ئەم بە شێوەیەکی هێندە جوان و قەشەنگ دەیڕازاندنەوە کە پاشا تەواو بەم کارەی دڵخۆش و سەرسام ئەبوو لە دەست ڕەنگینی مەلا برایم بۆیە لە پاداشتی ئەم کارە پیرۆزانەیدا هەر لە سەرەتای دروستبوونی شاری سلێمانیەوە ساڵی ١٧٨٤ و دوای دروستکردنی هەردوو قەیسەری نەقیب وەسمان پاشاو ئەو چەند خانەی دروستکرا بوون ڕیزێ دوکانی دروستکردو دوکانێکی کردە خەڵات بۆ مەلا برایم و دەی قوڵەڕەشیشی لەسەر تاپۆ کرد ئەو دوکانە ئێستا عەبدوڵلای عەلی برزوی قەسابی تیادایە لەو ڕۆژەوە تا ساڵانی حەفتاکان بە سەدان کتێبی نایاب و دانسقەی تێدا بووەو لەو ڕۆژەشەوە ئەم بنەماڵەیە هەر بە بەرگ تێگرتن و شیرازە و جزو بەندکردنەوە خەریك بوون تا ئەمڕۆ لە سەرەتای دروست بونیەوە مەلا عەلی سەرپەرشتی و بە ڕێوەی ئەبرد تاکۆتایی سیەکان بە سەدان کتێبی فارسی و تورکی و عەرەبی و کوردی و هەمو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە لە گەڵ هەموو کتێبە ئاینییەکان و چەندین کتێبی جۆراو جۆرو قورئانی پیرۆزی تیادا بوو ، لەم شارەدا ئەم کتێبخانەیە سەرچاوەی هەرەگرنگی ڕۆشنبیری بوو پاشان کە مەلا عەلی سەحاف لە کۆتایی سیەکاندا کۆچی دوایی کرد "مەلا عەزیز"[١٢] لەبەر ئەوەی پیاوێکی تا بڵێی زمان شیرین و روخۆشبوو خەڵکی زۆرتر هاتوچۆیان ئەکرد بۆ کڕینی کتێب و ڕۆژنامەو گۆڤار ئەمە جگە لەوەی بۆخۆشی زۆر دۆستی

مەلا عەزیزو شادمانی کوڕی

ڕۆشنبیران و شاعرانی ئەو کاتە بوو من خۆم زۆرجار کۆچکردو (کامەران موکری) شاعیرم لای مەلا عەزیز ئەبینی . لە کۆتایی شەستەکاندا ئیتر وردە وردە ئەم کتێبخانەیە پیشەی جزو بەند شیرازەو بەرگ تێگرتنی فایل و سجلاتی فەرمانگاکان بوو کەمتر ئەیپەرژایە سەر هێنانی کتێب و ڕۆژنامەو گۆڤار ؛ تا بە تەواوی وازیان لە کتێب فرۆشتن هێناو زۆرتر بە پیشەکەیانەوە خەریك بوون . ئێستا کوڕەکانی خوالێخۆشبوو مەلا عەزیز هەردوو برا کاك کامەران و کاك شادمان ئەم شوێنە بەڕێوە ئەبەن لە یەکێك لە دوکانەکانی بازاڕی تازە بەرامبەر دوکانە کۆنەکەی خۆیان.

# ٢- كتێبخانەی قادر ئاغای عەتتار [١٣]

## ١٩٢٠ — ١٩٦٨

مێژووی دانانی و دامەزراندنی ئەم دوكانەی قادر ئاغای عەتتار بە تەواوی نازانرێ ، بەڵام لە یادمە لە ناوەندی شەستەكاندا كە بۆ كڕینی كتێب و ڕۆژنامەو گۆڤارە كۆنەكان دەگەڕام و ئەچوومە سابونكەران بۆ كتێبخانەكەی ئەو كاتە خۆی ئەی ووت گوایە لە ساڵانی بیستەوە ئەم كتێبخانەیەم هەیە لە یەكدو نوسینی كورتدا لەسەر قادر ئاغای عەتتار مێژووی دامەزراندنی ئەم دوكانە بە هەڵە نوسراوە .

خوالێخۆشبوو لەتیف قەرەداغی لە ژمارە (١١٠) ی گۆڤاری رۆشنبیری نوێی حوزەیرانی ١٩٨٦ دا لە لاپەڕە (٣٦) ساڵی دروستبونی بە ساڵی (١٩٤٧) داناوە بۆ سەلماندنی ئەم هەڵەیەش پەنای بردۆتە بەر برایان مەلا مەحمود كزەڵ و محەمەد ئەمین ڕەباتی كە ئاماژەیان بەو ساڵە كردوە ، ئەم دوو برایە دوای دووجار گواستنەوەی دوكانەكەی قادر ئاغای عەتتاركە بۆ سێیەم جار لە ساڵی (١٩٤٧) پێیان زانیوەلە سابونكەران دایناوەو لەوێ دیویانە دیسانەوە هەر كۆچكردو لەتیف قەرەداغی بۆ زیتر جەخت كردن لەسەر ئەوەی كە قادر ئاغا كتێب فرۆش نەبووە و لە ساڵی ١٩٤٧ وە وەك عەتتاری وردەواڵە فرۆشی عەینك و قەڵەم و پاندان و قەوان لەم شارەدا بوە بۆیە دیسانەوە پەنای بردۆتەوە بەر گوایە بە بەڵگە هێنانەوە بۆ سەلماندنی راكەی كە بە ئاماژەكردنی قسەی

قادر ئاغای عەتتارلبیستەکاندا

خوالێخۆشبوو ئەحمەد شوکری (د شۆ) کە ووتویەتی :"قادر ئاغا کتێب فرۆش نەبوە..!"[١٤] پێمان بسەلمێنێ ، ئیتر منیش ناچار کەوتمە گەڕان و سۆراغ لە دوی پیاوانی راستگۆو متمانە پێکراو بە تەمەن و زیرەکی شارەکەم تا لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ بەڕێز (عوسمانی حەمە نادر)[١٥] دا دانیشتین و فەرموی :"هەردەم کە رۆژانە ئەچورم بۆ بازاڕ بە بەردوکانی قادر ئاغای عەتتارا رائەبوردم کە بەرامبەر بازاڕی سەڵتە بور لە تەنیشت ماڵی برایم ئەحمەدی پارێزەر کە ئێستا (گەلەری زاموایە . م . ن) لە ئەسحابە سپی ئەوەی کە ئەو کاتە لە دوکانەکەی دا سەرنجی راکێشابووم دێڕێ شیعر بوو بە خەتێکی شکستەی فارسی جوان نوسرابوو لەسەر وێنەیەکی خۆی کە فیشەك لەخۆی بەستوەو خەنجەرێکیشی کردوە بەبەر پشتێنەکەیەوە لە زۆرر

سەرێیەوە هەڵیواسیبوو ئەو کاتە تەمەنم هەر هەشت نۆ ساڵ دەبوو لە حوجرە دەمخوێند بۆیە بە حینجەوە هەموو جار کە رائەبوردم ئەم خوێندنەوە تا وام لێهات بە تەواوی لەبەرم کرد تا ئێستاش لە یادمە کە ئەمە بوو.

*شهرتم عەتتار من خۆشخاطرم خادمي درگای عبدالقادرم*[١٦]

لە کۆتایی بیستەکانەوە و سەرەتای سیەکان دوکانەکەی گواستەوە تەنیشت حاجی سەعیدی خەڵواچی باوکی کاك کامیل حاجی سەعیدی حەڵواچی لە شەقامی کاوە کە ئێستا بازاڕی زانکۆیە . بۆ سەلماندنی شوێنی دووەمی دوکانەکەی قادر ئاغای عەتتار هەر بەڕێز عوسمانی حەمە نادر فەرمووی :"من خۆم چەندین جار کتێبی دینیم لێکڕیوە کەوا بزانم ساڵانی سی و لەوەو دواتر بوو . بەڵام لەو جێگایەی پێشووی کە بەرامبەر بازاڕی سەڵتە بوو نەمابو هاتبوە شەقامی کاوە هەر رێك دەرگای بازاڕی زانکۆ جێ دوکانی ئەو بو ، هەموجار خوالێخۆشبو حاجی تۆفیقم لەوێ ئەبینی دانیشتبو[١٧]".

ساڵی ١٩٤٧ قادر ئاغای عەتتار دوکانەکەی گواستەوە سابونکەران بەرامبەر پاسەکانی ئێستای سابونکەرانی تووی مەلیك لە زۆربەی بەرگی پشتەوەی گۆڤاری گەلاوێژدا پروپاگەندەی بۆ کراوە کە یەکێك بووە لە باوەڕ پێکراوەکانی بڵاوکردنەوەو فرۆشتنی گۆڤارەکە لە سلێمانی.

راستە قادر ئاغا عەتتاری بابەتی عەینەك و قەوانو قەڵەم پاندان و ئەو جۆرەها شتانە بوەو بەو ناوەوە ناوبانگی دەرکردوە.

بەڵام لە هەمان کاتیشا جۆرەها کتێب و رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەی چاپکراون دەفرۆشت و بڵاو دەکردەوە . دیارە قادر ئاغا حەزی ئەکرد وەك کتێب فرۆشی ناوی بکەوێتە ناو کتێبخانەی کوردییەوە . بەڵام ئەو سەردەمە رێژەی خوێندەوار کەم بوو . خەڵکی ئاسایی ئەوەندە پەرۆشی خوێندنەوە نەبوون ؛ بۆیە بۆ چەند جارێك لە رۆژنامەکانی ئەو سەردەمەدا ئاگاداری بڵاو کردۆتەوە کە گوایە هەموو جۆرە کتێبێکی لا دەست دەکەوێ . هەر لە سەرەتای کردنەوەی دوکانەکەی لەگەڵ عەتتارییەکەی کتیب و گۆڤارەکانی ئەو رۆژگارەشی دانابوو بۆ فرۆشتن بڕوانە ئەم ئاگادارییەی کە بۆ یەکەمجار و لە یەکەم "رۆژنامەی (١٨)" ئەوسای سلێمانیدا بڵاوی کردۆتەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

*اعلان*

*"انواع کتابی تورکی و عربی و فارسی بوم هاتوه هرکسی طالبه مراجعت به دوکانی بنده بکا*

*عەتتار*

*قادر اغا ")*

بەم ئاگادارییەدا ئەوەمان بۆ ساغ بۆوە کە یەکەم لە سەرەتای بیستەکانەوە قادر ئاغا کتێبی فرۆشتوە، دووەمیش لەو ساڵانەدا دامەزراوە. بۆ زێتر سەلماندنی راستی ئەمە فەرمون بزانن هەر بۆ هەمان مەبەست کە چۆن جارێکی تر دیسانەوە بانگەوازی بۆ کتێب فرۆشتنەکەی کردوە هەر لە "رۆژنامەکانی" (١٩) ئەوسادا بڕوانە چی نوسراوە:

*"تاريخی ئەدەبی ، اجتماعی ، فنی و رومانی متعددم هەیە*
*بە فیأتی أهون ایفروشم اوی طالبه مراجعت بکا.*

*عەتتار*
*قادر أغا"*

کەواتە بە بلاوکردنەوەی یەك لە دوای یەکی هەردوو ئاگادارییەکەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا بوو کە یەکەم لە سەرەتای بیستەکانەوە قادر ئاغا کتێبخانەی هەبووە دووەمیش وەك وتمان کتێبی فرۆشتوە، ئیتر لەو ساوە تا کۆتایی شەستەکان ئەم کتێبخانەیە مابوو.

ئەوانەی کە لەوێ ئەبینران زاناو ئەدیب و شاعیرو رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە بون کە نەمران مامۆستایان رەفیق حیلمی سالح قەفتان ، شێخ نوری شێخ سالح ، جەمیل سائیب ، ئەنوەر سائیب ، مستەفا سائیب ، شێخ محەمەدی خاڵ ، شێخ سەلامی شاعیر پیرەمێردی نەمرو دەیانی وەك ئیبراهیم ئەحمەد.

وەك ئەگێرنەوە بە هەمیشە قەوانەکانی دایکی جەمالو مەلا کەریم و سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانی لێئەدا. هەموو رۆژنامەو گۆڤارو کتێبە کۆنەکانی لا دەست ئەکەوت بۆ فرۆشتن . لە کتێبخانەکەیدا دوو قەنەفەی درێژی بەرامبەر یەك دانابوون بۆ ئەوانەی لەوێ رۆژنامەیان دەخوێندەوە دیارە بە پارە دوای خوێندنەوەی هەموو رۆژنامەکانی ئەو رۆژەی کە لای دەست دەکەوێت بە نرخێکی کەم لە عانەیەك کە چوار فلس بوو زیاتر

نەبوو خۆ ئەگەر کەسێك کتێبێکی بخواستایە بۆ مالەوە شەوی بە (١٠) فلس بوو.

هەموو جۆرە چاویلکەیەکی لابو بە تایبەت زەڕەبین بۆ کەسێ چاوی کز بوایە ئەیدایە دەستی و رۆژنامەیەکی ئەدایەو پێی ئەووت: "چۆنە بۆ چاوت ئەتوانی پێی بخوێنیتەوە" من خۆم لە نێوان پەنجاکانا کە ئەچووم رۆژنامەکانی ئەوسا بۆ مامۆستای خوالێخۆشبوو سالح قەفتان وەرگرم ئەم فەحس و عەینەك لەچاوکردنەی خەلکم ئەدی و زۆریش سەرقالْ بوو بە چاکردنی قەلّەم پاندانەوە چونکە ئەوسا لای ئەو نەبوایە کەسی تر نەبوو چاکی بکاتەوە وەك ئەیان ووت: لە دوکانەکەی قادر ئاغای عەتتار سەری کوێرە ماری تیا دەست ئەکەوێ هەزار رەحمەت لە گۆڕی.)

# ٣- دوکانی

# ڕەئووف ئەفەندی موسڵی عەتتار

## ١٩٢٢-٣-٩

لە سەرەتای بیستەکانەوە لە شاری سلێمانی جگە لەو دوو قەیسەرییە گەورەیەی بە ناوی وەسمان پاشاو نەقیبەوە هەبوون چەندین خانو دوکانی تری ناڵبەندو مسگەرو خومچیو ئاسنگەر هەبوون بۆ ئاڵو گۆڕکردنی کەلو پەلەکانیان بازرگانی ئەوسا هامووشۆوسەردانی ئەم قەیسەریانەو بازاڕوو دوکانەکانیان ئەکرد، زۆرینەی بازرگانەکانی ئەو کاتە لەم دوو قەیسەریەدا کۆبووبوونەوە عەتتار باشی ئەو ڕۆژگارە بوون، زۆریش سەربەست بوون لە کڕینو فرۆشتنی شتەکانیان، بۆ هەر شتێك فرۆشتنی هەبوایە لە دوکانەکەیاندا دایان ئەنا بۆ فرۆشتن، ئەو بابەتانەی ئەوسا لایان دەست ئەکەوت هەر لە کلافەی دەزوی بەغداو دەرزی سنجاقو صابونی ڕەقیو خەنەو وسمەو ئاڵەتو زەردەچەوە، دوکانەکانیان پێ سیخناخ کردبوو ئەوەی کە یەکجار سەرەنجی ڕائەکێشا لەو ڕۆژگارە تاریكو نەخوێندەوارییەدا ریزە کتێب بوو لە شوێنێکی تایبەت لەسەر ڕەفەو بە تەنافا هەڵواسرا بووبۆ فرۆشتن. کە ئەویش دوکانی قاراغای عەتتار بوو وەك لە سەرەتای ئەم کتێبەدا باسکرا بەرامبەر بازاڕی سەڵتە لای ماڵی برایم ئەحمەد کە ئێستا گەلەری زاموایە بەڵێ لەو ڕۆژگارەدا بۆچەند جارێك وەك باسکراوە قادر ئاغا

بانگەوازی بلاوکردۆتەوە کە گوایە کتێبی چاكو زۆری هێناوەو لای ئەم دەست ئەکەوێ. هەر لە دوای گەڕانو سۆراخ بۆ زیاتر رۆشنایيو ساغکردنەوەی مێژووی کتێبخانەکان لەو رۆژگارەدا لە ۱۹۲۲/۳/۹ واتە رێك دوای ۳ مانگو چەند رۆژێك پیاوێکی عەرەبی خەڵکی شاری موسڵ بە ناوی رەئوفە ئەفەندی موسڵیيەوە لە هەمان رۆژنامەدا[۲۰] دوا بە دوایبانگەوازەکەی قادر ئاغای عەتتار ئەمیش ئەم ئاگاداریەە بەم شێوەیە بڵاودەکاتەوە. ( رسالە دینیە لەلایەن زیوەر افندی معلم مکتب نمونە سعادت رسالە یەکی دینیە بە کوردی ترجمە کراوە، قیمت نسخەیەکی هشت انایە کسێ ارزووی هبی مراجعت بدکانی روف افندی موصلی عەتتار بکات) کەواتە بەم ئاگادارییەی سەرەوەدا کە بڵاوکراوەتەوە کاتی خۆی بۆمان ئاشکرا ئەبێ ئەو کاتە لە شاری سلێمانی چەندین دوکانی چەپەكو لا کەنار هەبووە لە پاڵ سەرقاڵی فرۆشتنی وردە واڵادا – کتێبیشیان - فرۆشتووە کە ئەمەش لایەنی بە پیرەوە چونی خوێندەواريو روی گەشی شارستانی ئەم شارە دەردەخەن لەو رۆژگارە تاریكو دوا کەوتووەدا، بۆیە جێی خۆی بو ناوی ئەم دوکانانە بخەمە ناو مێژووی کتێبخانەی شاری سلێمانیەوە.

# ٤-دوكانی حەماغای عەتتار

## ١٩٤٣ -١٩٢٢

وتمان زۆربون ئەو دوكانانەی عەتتاری فرۆشبون لە پالیا كتێبیشیان دەفرۆشت ؛ دیارە ئەو رۆژانە پێشبڕكی یەكتریان كردوە لەبرەو بە زۆرتر فرۆشتن وەك زانیمان تەنیا نەقیب و وەسمان پاشا جێی ئەم عەتتارانە بوە بۆیە كە سەرنجمان دا پیاوێكی تر بەناوی محەمەد ئاغای عەتتار ، بەڵام ئەم شوێنی خۆی دیاری كردوە كە لە قەیسەری نەقیبە ، ئەوەتا لە رۆژنامەی [٢١] ئەو كاتە كە دەرچوە ئەمیش بانگەوازی بۆ بلاو كردۆتەوە كە كتێب فرۆشە"

*"بعضی كتیب مفیدم لە بغداوە هیناوە*

*اوانە طالبن مراجعت بفرمون نوع وفیأتی*

*عرضتان اكری و ای بینن لە قیصری نقیب*

*عەتتار : محمد اغا*

دیارە ئەو كاتە لە سلێمانی لەم چەشنە دوكانانە زۆربوون زۆریشیان هەر بەبەردەوامی لەبەرەو پێشچونا بوە حەماغای عەتتار كە پاشان گواستۆتیەوە بۆ بەرامبەر خوێندنگای فەیسەڵییەی ئەوسا واتە یەكدوو دوكان سەرو گازینۆی شەعب بەرامبەر بازاڕی عەسری ئەمەش لەو نامە بەرزە بەناوبانگەی (گۆران)ی شاعیردا كە بە مێژووی ١٩٣٢/٤/٤ ناردویەتی بۆ پیرەمێرد كە ئەو سالانە پیرەمێردو عەبدولواحید نوریو شێخ نوری

شێخ سالّح‌و دەیـان منـەوەرو رۆشـنبیری ئـەو رۆژگـارە لـە دوکـانی حـەماغای عـەتتار ئـەبینران جـا گـۆران لـە نامەکـەدا ئـەڵێت: ( استادی محترم: رەنگە لـە بیریشـتان چووبێـت: هـاوینی رابـردوو لـە دوکانی حماغای عەطار بە ملاقاتێکی بچوکتـان فـەیضی گـەورەم چنگ کەوت) دیسانەوە برای خۆشەویستم کاك ئەژی گۆران ووتی: "چەندین جار لەگەڵ باوکمانا واتا (گۆران)ی شاعیر ئەی بردین بـۆ وکانی حەماغای عـەتار بـۆ کڕینـی دەفتـەرو قەڵـەم‌و پێداویسـتی خوێندنگا کە دێتە بیرم چـاك لـە پـۆلی سـێیەمی سـەرەتایی بـووم هەروا ئەمڕوانی‌و سـەرنجی بـەردەم جاخانەکـەم ئـەدا ریـزە کتێبێـك هەڵواسـرابوو ئـەم دوکانـەش پێیـان ئـەووت بوغـازەی حـەماغای عـەتتار یـانی (کۆگـای حـەماغای عـەتتار) کـە جگـە لـە کتێـب فرۆشـتن پـانتۆڵ‌و کـراس‌و بۆینبـاخ‌و عـەترو وردە والآی تـری تیـا دەفرۆشرا ).

کـە زیـاتر سـۆراغم کـرد وتیـان تـا سـاڵی ١٩٤٣ ئـەم دوکانـە هەبووە، بەڵام بە ماڵئاوایی حەماغای عەتتار دوکانەکەش نەما.

# ٥- حوجرەکەی مەلا نەجمەدین [٢٢]

## یا "قوتابخانەی کەشتی نوح"
## کە دواتر بو بە کتێبخانەی کەشتی نوح"

خوالێخۆشبوو مامۆستا نەجمەدین مەلا ساڵی ١٩٢٦ بەرانبەر کۆشکەکەی تۆفیق قەزاز خوار ماڵی ئەوسای خوالێخۆشبو بابا عەلی شێخ مەحمود ، لە دوکانێکی چەپەکی بچوکدا حوجرەیەکی کردەوە بۆ ئەوەی منداڵان فێری خوێندن بکا . ئەوەی جێی سەرنج بوو لە حوجرەکەدا گۆشەیەکی خنجیلانەی بچووکی تەرخان کردبوو بۆ کتێب و رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەوسا ئەویش بریتی بوو لە چەند رەفەیەکی پەرپوتی تەختەی خوارو خێچ رۆژنامەو کتێبەکانی لەسەر ڕیز کردبون بۆ فرۆشتن و لەوانە رۆژنامەی ژیان پێشکەوتن و زاری کرمانجی کتێبە کۆنەکان و دەستنوس و کەشکۆڵی نایاب بە مەبەستی هەم خزمەتکردنیی ئەدەبیاتی کوردی و لەملاشەوە بۆ بژێوی ژیانی خۆی . نەجمەدین مەلا بە دەیان دیوانی شیعری شاعیرانی لە فەوتان رزگار کرد لە رێی نووسینەوەی بە دەست و خەتە جوانە ڕەنگینەکەی بە نرخێکی گونجاوی هەرزان ئەی فرۆشتنەوە بەوانەی کە داوایان لێ کردبو بە تایبەت دیوانی حەمدی بەگی صاحبقران [٢٣] مەولەوی نالی [٢٤] ، سالم ، کوردی هتد بە راستی نەجمەدین مەلا سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی

کەلەپوری نەتەوایەتیمانبوو جگە لەوەی بۆ خۆشی پیاوێکی کورد پەروەرو پاسەوانێکی دلسۆزی ئەدەبیاتی کوردی بوو .

مامۆستا مەلا نەجمەدین - نەورۆزی١٩٦١

لە دوای سالآنی چلەوەکانەکەی با بلێین حوجرەکەی گواستەوە بۆ ئەو کۆلآنەی ئێستای تەنیشت کتێبخانەی سلێمانی کە ئەچێتەوە سەر شەقامی سابونکەران لەوێش دیسانەوە حوجرەکەی بۆ جارێ تر کردەوە بە جێگای دەرس وتنەوەی منالآن .

پاشان لە سەرەتای پەنجاکانا هەمان حوجرەی بە هەمو تاق و رەفەو
مێزو کورسیەوە گواستەوە سەر شەقامی سابونکەران بەرامبەر
توونی گەرماوی موفتی بەڵام ئەمجارە دەرس وتنەوەی بە گەورە وەك
کریکارو کاسبکارو ئەوانەی بە رۆژدا خریکبوون بە کارکردنەوە
شەوانە لای ئەو ئەیانخوێند لە نێوان پەنجاکانیشا دەرسی تایبەتی
فارسیشی بەوانە ئەوتەوە کە حەزیان لە فێربونی زمانی فارسی بوو
.مەلا نەجمەدین یەکیك بو لە رۆژنامە نوسەکانی ئەوسای رۆژنامەی
(ژین) و گۆشەی تایبەتی هەبوو وەك "چیرۆکی منالان[٢٥]" بە
درێژایی ژیانی خەریکی نوسینەوەی چیرۆك و سەر گوزشتە و
پەخشان و هۆنراوەو پەند و وتاری کۆمەڵایەتی و مێژوویی و
روونکردنەوەی کتێب و نوسینەوەی دەستنووسە کۆنەکان مێژووی
ژیانی سەدان شاعیری کوردی لەسەر لاپەرەی رۆژنامەی (ژین)
بڵاو کردۆتەوە مەلا نەجمەدین هیچ کتێبی چاپکراوی خۆی نەبوە ،
بەڵام وەك ئاماژەمان بۆ کرد بە سەدان کەشکۆڵ و دیوانی
شاعیرانی بە دەست و خامە رەنگینەکەی نوسیوەو بڵاوکردەوە کە
خۆی بۆ خۆی وەك دەزگایەکی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەو رۆژگارە
وابوو .

ئەمەش خزمەتێکی یەکجار زۆری سامانی رۆشنبیری
نەتەوایەتیمانە لە فەوتان و ون بون پاراستوونی‌و چەندین
کەشکۆڵی نایاب‌و دانسقە لە پاشی بەجێماوە کەوتە لای زانای
خوالێخۆشبوو شێخ محەمەدی خاڵ کە کتێبخانەی کوردیانی پێ
دەوڵەمەند بووە وە لە هەمان کاتا سەرچاوەیەکی گرنگ و پڕ

بایەخی دەوڵەمەندی بۆ ئەمڕۆی ئەوانەی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی ئەنجام دەدەن . زۆر کەس لەم شارەدا کەشکۆڵی دەستنوسی مامۆستا نەجمەدین یان لایە ئەو قوتابخانەیەی ناوی نابو (کەشتی نوح) بە هەزاران پلەو پایەی بەرزی کۆمەڵایەتی بۆ پێگەیاندین ، دوای ماڵئاوایی کردن چەند بەرهەمی خۆی بۆ بەجێ هێشتووین لەوانە (کەشتی نوح) کە مامۆستا ساجید ئاوارە لە ساڵی ۱۹٦۸ دا چاپ و بڵاوی کردەوە وە نەبێ حوجرەکەی مەلا نەجمەدین لە "قەلەندەرخانەکەی" پیرەمێردی نەمر کەمتربێ.. نا بەڵکو بە دەیان منەوەر رویان تێ ئەکردو لای دادەنیشتن و مشتو مڕی وێژەوی شیعرو ئەدەبیاتیان ئەکرد لەوانە شێخ محەمەدی خاڵ رەمزی مەلا مارف زیوەر بیخودی شاعیر عارف قاپڕەش و گەلێکی تر . جاروباریش رۆژنامەنوسانی رۆژهەڵاتی‌و بیانی سەردانیان ئەکرد بۆ وەرگرتنی زانیاری . ئەوەی جێی داخ بوو دوای چەند رۆژێك بە مردنی زانراو تەرمەکەی بە شێوەیەکی سەرسام هاتە پێشچاو و هەموو ئەوانەی لەوێ بون دڵتەنگ و مات راوەستابوون بەرامبەر بە حوجرەکەی .

# ٦- دوکانی عومەر قەزاز

## ١٩٥٠ - ١٩٣٧

عومەر قەزاز

لە نێوان هەردوو سینەمای رەشیدو سیروانی ئێستادا کە هەردوو شەقامی مەولەوی و بێکەس بە یەك ئەگەیەنێ لە گۆشەی خوارەوەی ژێر دەبۆکە لە شوێنی ئێستای چێشتخانەی رەنگین لە دوکانێکی لاکێشەییدا هەموو بابەتەکانی وردەوالا فرۆشی ئەو کاتە وەك بۆینباغ و کراس و پانتۆڵ و عەینەك و قەوان و گەلێ شتی تر لەم بابەتانە لە لایکی دووکانەکەشیا هەموو ئەو چاپکراوانەی ئەوسا هەبوون لەسەر چەند رەفەیەك ڕیز

کرابوون رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو کاتەش هەموویانی هەبوو لە هەمووی سەیرتر گرامە فۆنێکی گەورە کە هەمیشە قەوانی تورکی و عەرەبی لێ ئەدا لێرەدا ئاماژە بۆ چاوپێکەوتنێکی تر ئەکەم لەگەڵ بەڕێز عوسمانی حەمە نادر [٢٦] کە دەڵێت "هێندە قەوانی تورکی و عەرەبی لێ ئەدا خەڵکەکە لەلاوە جاروبار گاڵتەیان پێ دەکردو ئەیان وت ڕەنگە بۆ ئابڕوبردن ئەم کارە بکات" دیارە ئەوسا خەڵکی رانەهاتبوون گوێ بگرن لە تورکی و عارەبی بۆیە هەر لە ساڵانی سی‌دا کۆمەڵێ لە لاوانی خوێن گەرم هەرچی قەوانی تورکی و عەرەبی لێداوە گرام و قەوانیان شکاندو عومەر قەزازیش لەم شکاندنەدا بەر کەوتوە هەر بۆیە ئەمجارە پەلی گۆرانی بێژی بەناوبانگ مەلا کەریمی گرتوەو بردویتی بۆ بەغداو چەند گۆرانیەکی بۆ تۆمار کردوە وەك لە چاوپێکەوتنێکدا کە مامۆستا کەمال رەوف محەمەد لە گەڵیدا کردویەتی و باسی ئەو گۆرانی تۆمارکردنە ئەکا . بەڵێ (عومەر قەزاز) هەمیشە لەگەڵ گۆڕانکاری سەردەم بوەو حەزی بە بابەتی نوێ کردووە بۆیە ئیتر لە ساڵی ١٩٤٠ بە تەواوەتی دوکانەکەی کرد بە کتێبخانەیەك‌و بوبە باوەڕپێکراوی ئەوسای گۆڤاری گەلاوێژ لە سلێمانی بۆ بڵاو کردنەوەو دابەش کردنی گۆڤارەکە هەر لە پشتی بەرگی گەلاوێژدا وا نوسراوە لای عومەر قەزازو برایمی مەلا مارف دەفرۆشرێ ئەم پیاوە وەك وتمان زۆر حەزی لەداهێنان کردوە لەگەڵ بەڕێوەبردنی کتێبخانەکەی لەگەڵ رەمزی قەزاز [٢٧] رێك ئەکەون بۆ هێنانی سینەمایەك بۆ شاری سلێمانی لە ساڵی ١٩٤٢ ماکینەیەکی

سینەمایان هێناو بەرامبەر بە گەراجی حەمەی فەرەجە فەنی هەر ڕێك بەرامبەر دەرگای ئێستای بازاری "ڕاپەڕین" کردیانەوە لە ساڵی ١٩٤٥ دا ڕەمزی قەزاز جیا بۆوەو سینەماکەی بردە سابونکەران لەوبەر مزگەوتی سەی حەسەن[٢٨].

ئیتر عومەر قەزاز بە تەواوی خۆی بۆ کتێبخانەکە تەرخان کردو هاتوچۆی بەغدای ئەکرد بۆ کتێب هێنان هەموو ئەو نوسراوانەی ئەو کاتە چاپ ئەکرا لە کتێب و ڕۆژنامەو گۆڤار لای ئەو دەست ئەکەوت تا لە ساڵی ١٩٥٠ دا وازی لە کتێبخانە هێناو بۆ یەکەمجار کارگەی سۆدەو سیفۆنی هێنایە سلێمانی بەلام دوکانەکەی گواستەوە شەقامی بێکەس تەنیشت دەرگای ئێستای بازاڕی ڕاپەڕین لە سەرەتای شەستەکانیشەوە وازی لەمیش هێناو ڕێزێ دووکانی لەشەقامی سابونکەران گرت و کردی بە کارگەی چلورەکە ئەمیش هەر یەکەم جار بو هاتە سلێمانی کۆمەلێ عاریانەی ڕازاوەی جوانی قەشەنگی بۆ دروست کردو بە کوچەو کۆلانی شەقامەکانی شاردا ئەسوڕانەوەو هاواریان ئەکرد ( ئایس کریم – چلورە – هتد... )

عومەر قەزاز لە شاری سلێمانی لە دایك بووە لە ساڵی ١٩٠٥ لە ساڵی ١٩٨٤ کۆچی دوایی کردوە.

# ٧- کتێبخانەی کۆمەڵی زانستی کوردان

## لە حوزەیرانی ١٩٣٠ - ١٩٣٨

دامەزراندنی کۆمەڵی زانستی کوردان لە لایەن ڕۆشنبیران و پیاو ماقوڵان و سەرۆك عەشایری دڵسوزو خەڵکی شارەوە بوو کە ئەویش لە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی بە ئیمزای ئەم سێ کەسە ١- مارف بەگی فایەق بەگ ٢- تۆفیق ڕەفیق پارێزەر٣- ڕەمزی حاجی فەتاح .

داوایە پێشکەش بە وەزیری ناوخۆ بکرێ بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی کردنەوەی "کۆمەڵی زانستی کوردان" کە ئەویش یاسای تایبەتی لەسەر دەرچوو بوو لە ساڵی ١٩٢٢ دا ڕێگە درابوو بە کردنەوەی ئەم جۆرە کۆمەلانە لە ١٩٢٦/١/٢٤ بە نوسراوی ژمارە (٢٥٧١) ڕەزامەندی وەزیری ناوخۆ وەرگیراو مۆڵەتیان پێ دا کە( کۆمەڵی زانستی کوردان ) بکەنەوە[٢٩]

ئیتر لەو ڕۆژەوە زۆر چالاکانە کەوتنە جموجووڵ یەکەم ئیش کۆکردنەوەی پارەو یارمەتی بوو بۆ کۆمەڵ کە پەیتا پەیتا ڕوژنامەی ژیان[٣٠] لیستی ئەو ناوانەی بڵاو دەکردەوە کە یارمەتیان داوە لە (٩) لیستی یەك بە دوای یەکدا لە ژیان بڵاو کرانەوە دووەم چالاکی کۆمەڵی زانستی کوردان بانگەوازێك بۆ دامەزراندنی کۆمەڵی بژاری کوردی کە نیاز لەم کۆمەڵی بژارە ئەوەبوو گەشە بە زمانی کوردی بدەن و بکەونە بژارکردنی وشەی بێگانە لە زمانی کوردیدا "نوسینی کوردی پەتی برەو پێ بدەن،

بەلاّم ئەم کۆمەڵی بژارە تەمەنی کورت بوو هەرزوو نەما. سێیەم چالاکی هەوڵدان بۆ کڕینی چاپخانەیەك کە بوو بووە خولیای هەموان بە تایبەتی پیرەمێردو رەفیق حیلمی بۆیە کەوتنە بانگەواز و ئاگاداری بلاّوکردنەوە بۆ کۆکردنەوەی پارە تا چاپخانەیەکی پێ بکڕن . ئەوەبوو پارەیەکی باشی بۆ کۆکرایەوە بەلاّم بە داخەوە ئەمیش کۆمەڵێ گیرو گرفتی هاتە رێ و نەتوانرا بیکڕن . چوارەم کردنەوەی خوێندنگایەك بۆ کاسبکاران و کرێکارو ئەوانەی بە رۆژ لە بازاڕا کاریان دەکرد شەو بچنە ئەو خوێندنگایەو فێری نوسین و خوێندنەوە بن بە خۆڕایی کە ئەویش کۆمەڵێ رۆشنبیری دڵسۆزی ئەوسا خۆ بەخش دەرسیان تیادا ئەوتەوە . پێنجەم لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٠ لە کۆبوونەوەیەکی گەورەو فراواندا کە زۆر لە بازرگان و پیاو ماقوڵان و ڕۆشنبیران و هەموو توێژو چینەکانی کۆمەڵ بەشدار بوون وەك کۆنفرانسێك وابوو بڕیار درا بە کردنەوەی کتێبخانەیەك هەر لە بارەگای کۆمەڵ کە ئەویش لە پڕۆگرامی ناوخۆی کۆمەڵداو لە خاڵی دووەم بڕگەی پێنج ئاماژەی بۆ کراوە.

لە سەرەتاوە دوان دانران بە لێپرسراوو ئەمینداری کتێبخانەکە ئەویش خوالێخۆشبوان جەمال بابان و توفیق وەهبی بەگ بوو . ئیتر بانگەوازیش بۆ کۆکردنەوەی کتێب و هەموو رۆژنامەو گۆڤارێك بلاّو کرایەوەو پۆل پۆل خەلکی بە کتێب و پارەوە روویان ئەکردە کۆمەڵ بۆ دامەزراندنی ئەو کتێبخانەیە تا وای لێهات بوو بە دەوڵەمەنترین کتێبخانەی ئەوسا کە خۆی ئەدا لە نزیکەی دوو هەزار کتێب زیاتر ئەمە

جگە لە سەدان گۆڤارو رۆژنامەی ئەو کاتەو چەندین دەستنوس و کەشکۆڵی نایابی تیادا کۆکرایەوە خەڵکی هامۆشۆیان ئەکرد بۆ خوێندنەوەی کتێب و ئەو رۆژنامانەی دەردەچوون جاروباریش ئەدرا بە خواستەمەنی بۆ ئەو کەسانەی کە ئە ناسران بیبەنە دەرەوە تا رۆژی ٦ ی ئەیلولی ١٩٣٠ کە رژێمی پاشایەتی پەیمانێکی چەپەڵی بەست لەگەڵ بەریتانیاداو کوردی لە مافە رەواکانی بێبەش کرد ، بۆ بە گژدا چونەوەو هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیمانە خەڵکی سلێمانی راپەڕین و هێرشیان بردە سەر سەرای سلێمانی و دوژمنیش بە شەست تیر وەڵامی خەڵکەکەی دایەوە ، بە دوای ئەم شەڕی بەردەرکی سەرایەدا کە ئەوسا زۆرتر وا بەناوبانگ بوو رژێم کەوتە داخستنی کۆمەڵی زانستی کوردان و داخستنی رۆژنامەی ژیان و زەبرو زەنگ نواندن . بەڵام هەر زوو دڵسۆزان خەمخۆرانی باری رۆشنبیری کوردی وازیان نەهێناو کەوتنەوە هەوڵ و تەقەلا بۆ کردنەوەی کۆمەڵی زانستی کوردان تا بە هیمەتی زۆری (کەریم سەعید زانستی) جارێکی تر لە ١٩٣١/٢/٢٥ دا رێگەیان پێ دایەوەو کەوتنەوە جمو جۆڵ و چالاکی نواندن تا ساڵی ١٩٣٨ ئەمجارە بە تەواوی داخراو دەسگیرا بەسەر هەموو کتێبخانەکەدا تا ساڵی ١٩٤٤ ئەوسا کتێبخانەکەی خرایە سەر مەعاریف ئەویش کتێبخانەیەکی گشتی دامەزراندو هەموو ئەو کتێبانەی کتێبخانەی کۆمەڵی گرتە خۆ.

# ٨- حوجرەکەی مەلا رەحیمی مەریوانی

## ١٩٧٠ — ١٩٣٠

مەلا رەحیمی مەریوانی

شوێنی ئەم کتێبخانەیە لە مزگەوتی هەمزاغا لە گەڕەکی گوێژە خوار چاپخانەی ژین لە حوجرەیەکی مام ناوەندی

پیاوێکی نوورانی ڕیش سپی ئێسک سووک لە پشت چەند باولێکی سیخناخ لە کتێب بە خۆی و چاویلکەکەیەوە هەمیشە سەرقاڵی خوێندنەوە بوو . ئەم پیاوە (ئیمام) ی مزگەوتی هەمزاغا بوو ناوی (مەلا عەبدولڕەحیمی عەزیز محەمەدە . لە ساڵی ١٩٠١ لە شارۆچکەی پێنجوین لە دایك بووە ساڵی ١٩٣٢ ز ژنی هێناوە و شەش منداڵی هەیەو دوو کوڕو چوار کچ هەموو لە ژیاندان . خێزانەکەی لە شێخەکانی قەرەداغە [٣١] ئەو پیاوە تا بڵێی پیاوێکی ڕو خۆش و دەم بە پێکەنین بوو هەر لە یەکەم بینینەوە ئەچوە دڵەوە، زۆر شارەزاو خوێندەوارو زیرەك بوو یەکێك لەو مەلا روناکبیرانەی کە هەر خۆی بۆ خۆی فێری ئینگلیزی بوە ، جگە لە زمانی کوردی بە هەموو شێوەکانیەوە، لە زمانی عەرەبی و فارسی زۆر شارەزابوو.

کتێبەکانی لە حوجرەکەیدا بە چواردەوری ژوورەکەیدا ڕەفەی بۆ کردبوون و زۆریشیان تەنافی بۆ هەڵواسیبوو و کتێبەکانی پێدا شۆڕکردبوونەوە چەند باولێك بە چوار دەوری جێگای حەوانەوەی نوستنەکەی خۆیدا ڕیز کردبوون کە هەموو پڕبوون لە کتێب ئەو حوجرەیە بەو هەموو کتێب و رۆژنامەو گۆڤارانەی ئەوسا هەبوون سیمای کتێبخانەیەکی پڕ شکۆ و دەوڵەمەندی پێوە دیاربوو هەر کە سەرنجت بدایە دڵسۆزی و خزمەتگوزاری ئەم پیاوەت بۆ دەرئەکەوت لەو سەردەمەدا کە ئەم یەکەم وەك دەزگای بلاوکردنەوەی چاپکراوە کوردییەکان

وابوو ئەو کتێبانەی لای ئەم هەبوون کوردی عەرەبی فارسی تورکی تاك تاك کتێبی ئینگلیزی و فەرەنسیشی تیابوو " پەیوەندییەکی توندو تۆڵی هەبوو لەگەڵ کتێبخانەکانی ئەو رۆژگارەدا وەك ئێران تورکیا هیندستان ، سوریە ، میسر ، ئوردن [٣٢] بۆ هێنانی کتێبی نوێ و دانسقە هەموو دیوانە کوردییەکانی لادەست ئەکەوت ، مەلا رەحیم هێندە مشورخۆری خوێندەواری و بڵاوکردنەوەی خوێندن بوو جگە لەو پەیوەندییەی لەگەڵ ئەو کتێبخانانە هەی بوو پەیوەندی توندو تۆڵیشی لەگەڵ رۆشنبیران و شاعیرانی ئەو دەمە هەبوو بۆ وێنە ئەو نامەیەی کە بۆ مامۆستا عەلادین سەجادی ناردو چۆن بە پەرۆشە بۆ بڵاوکردنەوەی چاپەمەنی کوردی بە هەمو لایەکدا. حوجرەکەی چاکتر بڵێین کتێبخانەکەی مەلا رەحیم بە دەیان رۆشنبیرو منەوەرو شاعیرو زانایانی ئەو سەردەمە رویان تێ ئەکرد لەوانە خوالێخۆشبوان رەفیق حیلمی سالح قەفتان شێخ نوری شێخ سالح جامیل سائیب جەلال سائیب ئەنوەر سائیب هەردو زاناو شاعیر شێخ محەمەدی خال وحاجی توفیق پیرەمێرد لەگەڵ سەردانی خوالێخۆشبوو عەلادین

سەجادی هەر کاتێك بهاتایەوە بۆ سلێمانی، دو دۆستی زۆر خۆشەویستیشی هەبوو لە بەغدا کە هەموو ئەو دیوانە کوردییانەیان بۆ چاپ ئەکردو ئەیان ناردەوە بۆ ئەم تا بلاویان بکاتەوە یەکەم تایەر بە هجەت مەریوانی بوو کە نازناوی (ت.ب مەریوانی) بۆ خۆی هەلبژاردبوو تایەر کوری مەلا مەحمودی مۆرهەلکەنە لە سالی ١٩٠٢ لە سلێمانی لە دایك بوە هەر لە منالیەوە خراوەتە بەر خوێندن لە حوجرەی ئەوسای مزگەوتەکانی سلێمانی پاشان چۆتە خوێندنگای (روشدیە) لە سالی ١٩٢٨ سلێمانی جێهێشتوەو چۆتە بەیتەریەی خانەقین لەوێ دامەزراوەو زۆریش نەماوەتەوە چۆتە بەغدا. ئیتر لە بەغدا لەگەل دۆستی منالی خۆی (مستەفا سائیب[٣٣]) کەوتنە چاپکردنی زنجیرەیەك کتێبی کوردی و ئەیان ناردەوە بۆ کتێبخانەکەی مەلا رەحیم لە حوجرەی مزگەوتەکەی هەمزاغا تا بیان فرۆشێ ئەم مستەفا سأیبە لە سالی ١٩٠٤ لە سلێمانی لە دایك بوەو لە سالی ١٩٨٠ کۆچی دوای کردوە ئەمەش لیستی ئەو زنجیرە کتێبەیە کە لە بەغداوە چاپیان ئەکردو ئەیاناردەوە بۆ مەلا رەحیم مەریوانی - کە بە ناوی (کوردی و مەریوانی) یەوە بلاو دەکرانەوە.

زنجیرەی (کوردی و مەریوانی) [٣٤]

١-دیوانی کوردی (مستەفا بەگی کوردی) ١٩٣١ بەغدا چاپخانەی السلام /٣٨/ لاپەرە.

٢-ديوانی نالی (مەلا خدری شارەزوری) /١٩٣١)
بەغداد = = /٦٩/ لاپەرە.

٣- گۆرانی کوردی ١٩٣٢ / بەغداد چاپخانەی مەریوانی
٧٢ لاپەرە.

٤- یاری /١٩٣٢ / بغداد چاپخانەی دارالسلام /٣٠/
لاپەرە.

٥- هەموو کچێك چی بزانێ/١٩٣٣/ بەغداد چاپخانەی
کەرخ/٨٦/ لاپەرە.

٦- یادگاری لاوان/١٩٣٣/ بغداد = =(٣٣) لاپەرە.

٧- دیوانی سالم(عبدالرحمن بەگی صاحبقران) ١٩٣٣
بەغداد (چاپخانەی ئیتام) (١٠٧) لاپەرە.

٨- خورشیدو خاوەر ، میرزا مستەفا دەلی سنەیی /
ئەحمەد شوکری و مەریوانی /١٩٣٣ / بەغداد چاپخانەی
نەجاح /٧٥ لاپەرە.

٩- توتنەکەمان/ ١٩٣٣ / بەغداد چاپخانەی مەریوانی
(٤١) لاپەرە.

١٠- گوللەیەك لە تاریکیدا /چیرۆکی وەرگێڕاو / ١٩٣٥ /
بەغداد چاپخانەی مەریوانی (٤٠) لاپەرە.

١١- دیوانی شێخ رەزای تالەبانی /١٩٣٥) / بەغداد /
چاپخانەی مەریوانی (٢٣٦) لاپەرە.

١٢- دوو تەقەلای بێسوود/ محەمەد ئەمین زەکی بەگ/
١٩٣٥- بەغداد چاپخانەی مەریوانی (٦٩) لاپەرە

١٣- دیوانی حەریق / مەلا ساڵح نصـراللە (١٩٣٩) بەغداد چاپخانەی مەریوانی (١٠٣) لاپەڕە ، ئەم كتێبخانەیە بەم شێوەیە مایەوە تا ساڵی ١٩٧٠ ئیتر مەلا رەحیم مەریوانی وازی لە بەڕێوەبردنی كتێبخانەكە هێنا بە وازهێنانی مەلا رەحیم كتێبخانەكەش نەما مەلا رەحیم مەریوانی بۆ دواجار لە ساڵی ١٩٨٠ زاینیدا ماڵئاوایی كرد لە كتێبخانەی كوردی.

# ٩- دوکانی مەلا ساڵح مەلا زوبێر [٣٥]

## ١٩٣٠ — تا نێوان پەنجاکان لە خانەقای حاجی مەلا عەلی بوو

مەلا ساڵح مەلا زوبێر

بەڕێز پرۆفیسۆر د. عیزەدین مستەفا رەسول [٣٦] دەڵێت: "
مەلا ساڵحی مەلا زبێر دوکانی کتێب فرۆشی هەبوو،
سەردەمێک لە بازاڕی سەردەریلە لە خانەقای حاجی مەلا عەلی"

بەڵێ کە کەوتمە گەڕان بە دوای شوێنەکەیدا مامۆستا مەلا نوری عەزیز مامۆستاو[٣٧] " ووتی : " لە ساڵی ١٩٣٠ یەوە تا ساڵی ١٩٤٢ کتێبخانەی هەبوە لەناو بازاڕ بەڵام شوێنەکەی نەزانراوە تا ساڵی ١٩٤٢ وەوە هەر هەموو کتێبەکانی گواستەوە بۆ ناو حوجرەکەی خانەقای حاجی مەلا عەلی لە سەرشەقام و ئیتر هەر خۆی لێپرسراوو سەرپەرشتی ئەکرد" دەیان کتێبی ئاینی و قورئانی پیرۆزو دیوانی شاعیرانی کوردی تیادا بوو جگە لەو هەموو رۆژنامەو گۆڤارە کۆنانەی ئەو سەردەمە. جۆرەها کتێبی فارسی تورکی عەرەبی تیا بوو ، ئەمە جگە لە دەیان دەستنووس و کەشکۆڵی نایاب و دانسقە کە لەوکتێبخانەیەدا پارێزراو بون و لە فەوتان ڕزگار بون ئەو زاناو رۆشنبیرانەی هاموشویان ئەکرد خوالێخۆشبوان ((پیرەمێرد ، بێخود ، زیوەر ، مەلا مستەفای سەفوەت و دەیانی تر.

# ١٠- دوكانی مەلا سالّحی عەبابەیلی [٣٨]

## ١٩٣١ - ١٩٥٥

لە سەرەتای سیەكانەوە لەناو بازار لە تەنیشت بازاڕی ئاری لەسەر پێپیلكانەكانی بەرانبەر دوكانی بەكری حاجی دەرویشی قەساب كە لە وێوە ئەچێت بۆ قەیسەری نەقیب دوكانێكی بچووك دانرابوو هەرچی تیادابوو كتێب و رۆژنامەو گۆڤارە كۆنەكانی ئەوسا بوون لەوێ ئەفرۆشران ، مەلایەكی زیرەك و هۆشیارو دلّسۆزبوو ، هەر خۆی كتێبخانەكەی بەڕێوە ئەبرد هەمیشە زانایان و رۆشنبیران هاموشۆیان ئەكرد وەك خوالێخۆشبوان مەلا مستەفای مەلا رەسول (سەفوەت) مامۆستا یونس ئەفەندی توفیق عەبدولرەحمان كە بەڕێوەبەری قوتابخانەی خالیدیە بوو هەروەها مامۆستا جەلال محەمەد سەیفولّا كە ئەویش بەڕێوەبەری قوتابخانەی فەیسەلیە بوو ئەمانەو دەیان پیاوانی ئیمانداری تر لای دادەنیشتن .. ماموستا حەمەبۆر ووتی :"خوالێخۆشبور حەمە ئەمین عەسری لە پەنجاكاندا چاپخانەی هەبور لە كەركوك كاتی خۆی فەقێ بوو لە مزگەوتی موفتی ئەو كاتانەی دەرسی نەبوایە ئەچوولای مەلا سالّحی عەبابەیلێ و مەلا رەحیمی مەریوانی كتێبی وەرئەگرت لەبەردەم نەخۆشخانەی خوارەوەی ئەوسای سلێمانی كە ئێستا جێی وەستانی ئۆتۆمبیلە بەرامبەر بازاری زانكۆ لە شەقامی كاوە بە پێوە ئەوەستاو كتێبەكانیشی لەبن دەستیا ئەیفرۆشتن تا لە قازانجی ئەو كتێبانە بژیوی خۆی پەیدا بكا [٣٩] مەلا سالّحی عەبابەیلێ

جگە لە فرۆشتنی کتێب و ڕۆژنامەو گۆڤار چەند کتێبێکیشی چاپ کرد وەك :

١- فەتحی قەڵای خەیبەر/ فەقێ محەمەدی ژاژەڵەیی/ مێژووی لەسەر نییە.

٢- لەیلو مەجنون / مەلا فەرەج سالح/ شەکیبی شاعیر/ مێژووی لەسەر نییە.

٣- ڕۆستەمو زۆراب/ شێخ فاتحی شێخ فەتاحی دۆلاَت/ مێژووی لەسەرنییە، ئەم کتێبە چەند جارێك چاپوبلاَوکراوەتەوە[٤٠].

# ١١- دوكانی ئەحمەدی خاڵە لە

## ١٩٣٩ تا سەرەتای پەنجاكان

لە كۆتايی سيەكانداو لە ساڵی ١٩٣٩ لە شەقامی كاوە شوێنی دەرمانخانەی شەوكەت) ی ئێستا دوكانێكی پڕ لە كتێب و ڕۆژنامەو گۆڤاری ئەو سەردەمەبوو لە زۆر كەسم پرسيار كرد ، هەر ئەوەندە زانياريم دەسكەوت كە تا سەرەتای پەنجاكان ئەو دوكانەی مابوو لەوە زياتر هيچ زانيارییەكی ترم چنگ نەكەوت .

# ١٢- دوكانی نوری مەلا سمايل

## ١٩٤٧ و هەر هەمان ساڵ داخرا

ئەم دوكانە لە شەقامی مەولەوی لەسەر پردەكە لە شوێنی (يانەی تەوار) ی ئێستا دانراو هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارەكانی ئەو كاتەی لابوون لەگەڵ هەموو چاپكراوەكانی كە دەردەچوون هەر هەمان ساڵيش لە لايەن ڕژێمی پاشايەتی ئەوساوە داخراوە، ئيتر نازانرێ بۆ..؟

لەسەرچی داخراوە . گەرچی زۆر سۆراخم كرد هيچ زانيارییەكم لە بارەيەوە دەست نەكەوت.

# ١٣- دوکانی برایمی مەلا مارف

## لەسەرەتای چلەکانەوە

سالی ١٩٤١ تا کۆتایی سالی ١٩٤٩ لە شەقامی مەولەوی تەنیشت گەرماوی قشلە کە ئێستا بازاڕی دەبۆکەیە دوکانێکی دانابوو هەموو جۆرە بۆینباخ و عەینەك و پانتۆڵ و کراس لە لایەکی دوکانەکەشەوە لەسەر چەند ڕەفەیەك بەرێز کتێبی دانابوو بۆ فرۆشتن ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەوساش کە دەردەچوون لە بەغداوە بۆی ئەهات یەکێك بوو لە باوەڕ پێکراوەکانی گۆڤاری گەلاوێژ لە سلێمانی بۆ فرۆشتن و بلاوکردنەوەی گەلاوێژ تا سالی ١٩٤٩ ئەم دوکانەی بوو لەوە پاش وازی لە کتێب فرۆشتن هێناو کەوتە هێنانی ماکینەی درومانی، بە تایبەت ماکینەی (سنجەر) ئیتر لەو ڕۆژەوە بە (بلەی سنجەر) ناوبانگی دەرکرد لە سلێمانی.

# ١٤- كتێبخانەی ئازادی

## ١٩٤١—١٩٤٥

مەحمود ئەحمەد

ئەم کتێبخانەیە لەبەر دەرکی سەرای سلێمانی و سەرەتای شەقامی مەولەوی بەرامبەر بازاڕی عەسری ئێستا بوو لە لایەن

دوو ئەندامی چست و چالاکی (کۆمەڵەی برایەتی) یەوە دامەزرا کە یەکەمیان (مەحمود ئەحمەد)[41] بوو. دووەم (محەمەد خدر کۆیی)[42]

بە هەردووکیان ئەم کتێبخانەیەیان بەڕێوە ئەبرد ، ئەمیش وەك هەمو کتێبخانەکانی سەردەمی خۆی هەرچی چاپکراوی بلاو بکرایەتەوە لای ئەمان دەست دەکەوت هەموو رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو رۆژگارە لەم کتێبخانەیەدا هەبوو لە ساڵی ١٩٤٥ کە خوالێخۆشبوو مەحمود ئەحمەد لە لایەن رژێمی پاشایەتیەوە دەستگیر کرا ئیتر کتێبخانەکە پێچرایەوەو نەما. ئەوانەی کە هاتوچۆیان ئەکرد بە هەمیشە بریتی بوو لە رۆشنبیران و کەسایەتی ناسراوی ئەوسای کوردایەتی وەك خوالێخۆشبوو دۆستی دێرینی مەحمود ئەحمەد خوالێخۆشبوو شێخ لەتیف) ی شێخ مەحمودی حەفیدو محەرەم محەمەد ئەمینی نوسەر و محەمەد مستەفای پارێزەر و گەلێ لە ئەدیب و منەوەرانی تر هاموشۆیان ئەکرد.

# ١٥- خانەی گەل

## ١٩٤٤/١٠/١٣

## یا کتێبخانی گشتی سلێمانی

موحەرەم محەمەد ئەمین

هەر لەمێژدوە پیرەمێردی نەمر بە بڵاوکردنەوەی بانگەوازو نیازو خوازی دامەزراندنی کتێبخانەیەکی گشتی بۆ شاری سلێمانی لە هەوڵ و کۆششا بوو هەمیشە سەرقاڵی ئەو پرۆژە پیرۆزە بوو ، هەر لە کۆتایی سیەکانەوە بە بەڵگە ئەو نیاز پاکییەی لە دوو تووی نوسینەکانیا ئەدرەوشانەوە ساڵی ١٩٣٧ یەکەم نوسینی رۆژنامەی (ژین) لەژێر ناونیشانی ئارەزووەدا بڵاو کردەوە ، لەبەر

گرنگی ساغکردنەوەی دامەزراندنی کتێبخانەی گشتی سلێمانی هەموو ئەو نووسین و بەڵگانەم بە دەق گواستۆتەوە ، بۆ ئەوەی تێکۆشان و ڕەنجی ئەو دڵسۆزانە لەبەرچاو بێ کە هەوڵ و تەقەلاّ یان داوە لەم ڕێیەدا ("ئارەزوو".

خوێندن تەنها ئەوە نیە کە لە مەکتەب و دەرسخانەدا پەیدابێ، بەهرەی چاك بە خوێندنەوەو تتبعاتی دوایی تەحصیلە ، کە ئەویش بە کتێبخانە دەبێ . لە هەمو شوێنێك کتێبخانە هەیە زۆریشی لێ ئیستیفادە دەکرێ ، چونکە کتێبخانە تەنها بۆ کتێب خوێندنەوە نییە ، زۆر ئەحباب بە یەکەوە لەوێدا استفادە لە علم و مصاحبەی یەك دەکەن ، زۆر بێگانە ئەبن بە دۆست . کە لەوێدا ، رابوێرن زۆر مصرفی بێهودەو سفاهتیان لە کۆڵ ئەکەوێ ، ئێمە ناتوانین بە تەواوی فائیدەی کتێبخانە بیان بکەین ، جا یەکێ لە ئارەزووەکانمان ئەمەیە :

سەعادەتی متصرف رۆژێ پیاو ماقوڵە دەوڵەمەندەکانمان کۆ بکاتەوەو اساسێ دابنێ بە همەتەوە ، وە بەڵکو کتێبخانەیەك وەك کەرکوك لێرە بکرێتەوەو ئەوقافیش مساعدە ئەکا کە مزگەوتی نەقیب جێگایان بداتێ، ئەمە اثارێك ئەبێ .. تأریخی.) [٤٣]

لێرەوە کەوتمە هەنگاونانی گەڕان و سۆراغ بەدوای مێژووی دامەزراندنی کتێبخانەی گشتی سلێمانیدا . لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ بەڕێز کاك (محەمەد فەتاح[٤٤]) دا ووتی :لەناو کۆمەڵێ فایلدا کە ئێستا لەبەر دەستا نەماون نوسراوێك هەبوو ئاماژە بە

رۆژی ١٩٤٣/٦/٣٠ ز ئـەکات کـە کتێبخانـەی گشـتی سلێمانی تیادا دامـەزراوە) [٤٥].

بۆیـە کەوتمـە گـەڕان و پرسـیارکردن لـەدووی ئـەو فایلـەو لەئەنجامیشدا بۆم نەدۆزرایەوە؛ ناچار کەوتمە پشکنین و هەڵدانەوەی لاپـەڕە کۆنـەکانی رۆژنامـەو گۆڤارەکـانی ئـەو سـەردەمە بـەڵکو مێژووی راستی دامەزراندنی کتێبخانەی گشـتیم چنـگ کـەوێ لـە هەڵدانەوەی رۆژنامەکاندا چاوم کـەوت بـە چاوپێکـەوتنێك لەگـەڵ خوالێخۆشـبوو عـەبدوڵڵا عەبدولکـەریم ئـەمینداری کتێبخانــەی گشـتی لـەو دیدارەدا ئـەڵێت دامــەزراندنی کتێبخانـەی گشـتی سلێمانی مێژووی دروستبوونی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی ١٩٤٦ [٤٦] دیسـانەوە هـەر لێپرسـراوی کتێبخانــەی گشـتی خوالێخۆشـبو عـەبدوڵڵا عەبدولکەریم لـە چاوپێکـەوتنێکی تـردا دەڵێـت : (لـە ١٩٢٣/١/٣٠ دامـەزراوەو سـەرەتا پـەیوەندی راسـتەوخۆی بـە وەزراەتی پەروەردەی ئەوسـاوە بـوەو لـە هـەمان کاتیشـا بینایـەکی دەوڵەت نەبوە بۆی ، لە خانوویـەکی کرێدا لـە سابونکەران بـوە ، پاشـان گواسـتێوە بـۆ بەرامبـەر مزگـەوتی گـەورەو لـە نێـوان پەنجاکانیشا چوە سەر ئیدارەی ناوخۆ تا لە سـاڵی ١٩٤٥ لـەوە دوا گواستێوە بۆ تەنیشت کارگەی جگەرەی ئێستا [٤٧]

لـە هـەردوو ئـەو چاوپێکەوتنانـەدا خوالێخۆشـبوو عـەبدوڵڵا عـەبدولکـەریم عــەلاف زۆر بەهەڵـــەداچوو بـــوو؛ نەســـاڵی دامـەزراندنەکانیو نە لە سابونکەرانەوە چوە بۆ مزگەوتی گەورە.

با بگەڕێینەوە سەر بەڵگەی دروست و زیندو کە هەر تەنیا پیرەمێردی خەمخۆرە بەو هەموو ئاگاداری و بانگەوازانە پەیتا پەیتاو یەك لە دوای یەك بڵاوی دەکردنەوە بتوانین بگەینە راستی مێژووی دامەزراندنی کتێبخانەی گشتی سلێمانی . ئەوەتا جارێکی تر لە ژیان" دا ئاخ هەڵدەکێشێ بۆ کردنەوەی کتێبخانەیەك (سەعادەتی متصرف بۆ هەندی کاروباری دیوانی خۆی تشریفی چوو بووە پایتەخت و گەڕایەوە ". بەخێربێتەوە . وەك بیستوومانە بۆ اعماری مملەکەتەکەمان مساعدەی زۆری کراوە ؛ انشاالله اثاری شیرین و رەنگین ئەبینن .. ئاخ ؛ خۆزگە کتێبخانەیەکی بە اثاری خیرییەی بۆ بەرهەم دەهێناین غدای رۆحمان ئەبوو [٤٨]) .

نابێ لەبیرم بچێت لێرەدا ئەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەم لە پەیداکردن و گەڕان بە دوای ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەدا هاوڕێو برای شیرینم کاك یاسین قادر بەرزنجی رۆژنامە نووس یارمەتیەکی بێ وێنەی دام بەو پەڕی دڵسۆزییەوە هات بە پیرمەوە کە لە شوێنێکی تر دا دێمەوە سەر ئەم باسە، ئەمە جگە لەوەی بەڕێزی بەڕێوەبەری کتێبخانەی گشتی سلێمانیە.

بەڵێ ئەوانەی تەمەنیان هەیەو جێی متمانەن لە گێڕانەوەی مێژوو لە هەمان کاتیشا راستگۆو رۆشنبیری هوشیارن لە رووی زانیارییەوە لە زۆر لایەنی شاراوەی ژیانی ئەوسای سلێمانی بۆیە سەردانی بەڕێز عوسمان محەمەد نادرم کرد بۆ ماڵەوەو لەو چاوپێکەوتنەدا سەبارەت بە دامەزراندنی کتێبخانەی گشتی سلێمانی فەرمووی: ( نازانم ساڵەکەی کەی بوە ، بەڵام چاك لە

بیرمەو ئەزانم کە کتێبخانەیەك لەسابونکەران هەبوە کە میری دایمەزراندوەوپاشان ئەو کتێبخانەیە گواستیوە گەرەکی شێخان لای ماڵی خوالێخۆشبوو شێخ قادری حەفیدو دواتر هاتە تەنیشت نەخۆشخانەی گەورەی ئەوسای سلێمانی لە شەقامی پیرەمێرد کە ئەوێی چۆڵ کردبوو بە جێگای هونەرمەندان)(٤٩) هەروەها مامۆستا عومەر عەلی ئەمین لە نامەکەیدا نووسیویە (سەرەتای ١٩٤٧ ئەم کتێبخانەیە لە خانوویەکی دوو نهۆمدا بوو لە شەقامی مزگەوتی گەورە کە ئێستا

عەبدولکەریم عارف

بەرەو ژوور دەبێتەوەبۆ دادگا نزیك ماڵی شێخ قادر تەنانەت ئەوەم لە بیرە (١٩٤٧) کە ساڵێك بوو مامۆستا بوم یەکەمجار خوێندکارەکانی پۆلی پێنجو شەشم ئەبرد بۆ ئەو کتێبخانەیە بە مەبەستی بینینو راهێنانی قوتابیەکان لەسەر هامۆشۆی

کتێبخانەو خوێندنـــەوە، هـەر جـارەی یـەکدوو سـەعاتێکیش لـەوێ دەمـاینەوە). [٥٠] بەم دوو رونکردنەوەیەدا ئەوەمـان بۆ ئاشکرا ئـەبێ کە یەکەمجار لە سابونکەران بوەو دواتر گواسـتیوتیەوە بـۆ گـەرەکی شێخان دوایـی بـە قسـەی عوسمـان حەمـە نـادر هاتۆتـە شـەقامی پیرەمێرد خوار نەخۆشـخانەی دانەکـەی ئێسـتا پاشـان لـە سـالانی ١٩٦٥ دا بینـایەکی بۆ دروستکراوە بەرامبەر مزگەوتی گەورەو لـە شوێنی باخچەی ساوایانی ئەوسا ئەوەتا رۆژنامەی "ژین" ئاماژە بە دروستکردنی ئەو بینـایە ئەکا (کتێبخانەی گشتی تازە)

(لە رۆژی یەك شەممە رێکەوتی ١٩٥٦/٨/٢٦ بە ئاهەنگێکی خـۆش وەکیلـی متصرفـی لیـوا بـــەردی بناغـــەی بینـــای تـــازەی کتێبخانەی گشتی دانا، کە لــە شـوێنی باخچـەی منـالانی ئێسـتا دروست ئەکرێ، وە ئــەم کتێبخانەیـە نـاونرا" خانـەی گـەل" وە بـۆ ئەوەی کە بە تەواوی پیشان بدرێ کە هەموان تیابەشـدار بـوون لـە کردنیا، لە هەردێ و ناحیەو قەزایەك کیسەیەك خۆل هێـنرابوو، وە خرایە بناغەی بینایەکەوە) [٥١].

ئیتر لەم شوێنە مایەوە تا سالّی ١٩٦٥ و بینایەکی گەورە تـر لەمـەی خـۆی بـۆ دروسـتکراوە لـــە تەنیشـــت کارگـــەی جگـــەرەی سلێمانیو گواستیوە ئەوێ نـــاونرا "کتێبخانـەی گشـتی سـلێمانی" بەلاّم هێشتا بەتەواوی ئەوەمـان نەزانی کە سالّی چەند دامـــەزراوە بۆیە جارێکی تر "ژیـن" مـان هەلّدایـەوە نوسـرابوو( "مزگێنـی" ئەمرۆ لە مەقامی متصرفیەوە دەعوەتنامەیەکمان وەرگرت مژدەی ئەمـەی تیـا بـوو کـە ئـەم رۆژی جمعەیـە، کتێبخانـــەی مـــەعاریف

ئەكرێتەوە، من بەش بە حاڵی خۆم ئەم كتێبخانەیەم لە سێ مەكتەبی بلند پێخۆشتر بوو، چونكە بەراوردم كردووە لە زۆر كەسیشم بیستووە، خوێندنەوە لە خوێندن كەڵكی زۆرترە.

بەڵێ خوێندن سەرمایەیەكی تێگەیشتن و زانین ئەبەخشێ، تەنیا لەو دەرسانەی كە پێیان ئەڵێن، ئەمەیان داناوە بە تەحصیل ئەگینە خوێندنی پێ ئەڵێن، دوای ئەمە خوێندنەوە هەیە كە تتبع و مطالەعەیە چونكە بە

محەمەد ساڵح دیلان

هەوەسی خۆیەتی باشتر ئەچەسپێتە دڵەوەو ئارەزوو و زەوقێكی دەوامی تیایە، دەرس محدودەو متالەعەیەداو بەرەڵدایە لە هەموو بابەتێك بەهرەی لێ وەردەگیرێ و ئەچێتە حافزەوە، زاتەن ئەوە دیارە حافزە باشترە، چونكە ئەوەی گرتیە دەماغیەوە لە هەر

شوێنێکدا پێویست بوو ئەتوانی بی هێنیتە کار، بەڵام ئەگەر لەسەر کتێبێك بێ تا هەڵ نەسێ کتێب نەهێنیێو بۆی نەگەڕێ نایەتەوە بیری، ئێستا پێویستە باربۆی کتێب بکری)[٥٢].

بەم نووسینەی پیرەمێردا بۆمان دەرکەوت کەرۆژی جومعە کە ١٣ مانگە واتە ١٣/١٠/١٩٤٤ز رۆژی دامەزراندنی کتێبخانەی گشتی سلێمانیە بۆیە هەر لەو نوسینەدا نرخو بایەخی کتێبخانە دەردەخا لە رووی رۆشنبیر کردنەوەی کۆمەڵگای کورددەواریو هەڵ سەنگاندوە بە سەرمایەیەکی پڕبایەخ بۆ فێربوونی زانینو هۆشیار کردنەوە لە هەموورویەکی ژیانەوە، لە کۆتایی نوسینەکەیدا داوای کۆمەكو یارمەتیو باربۆ کردنی کتێب دەکا بۆ ئەو کتێبخانەیە، بەڵێ لەو رۆژەوە ئەم کتێبخانەیە کراوەتە، رۆژنامەی ژین هەمیشە بەسەری کردۆتەوەو لەسەر هەموو لایەنێکی ئەو کتێبخانەیەی نووسیوە بەپێی ئامارێکی رێكو پێك بە ژمارە هەر تەنیا خاڵێك باسی لێوە نەکراوە کە ئەویش لێپرسراوو ئەمینداری ئەوکتێبخانەیەیە کە نازانرێ کێیەکەم هەڵسوڕێنەری بووە هەر بۆ هەمان مەبەست ڕووم لەکردووە برای ئازیزمان بەڕێوەبەری گشتی کتێبخانەی گشتی سلێمانی کاك یاسین قادر بەرزنجی تا ئەو گیرفتەمان بۆ بکاتەوە بەڕێزی لیستێکی پێدام کە بەپێی تەواری ئەو بەڕێزانەی تێدا بوو

١- ئەحمەد محەمەد ئەمین[٥٣] ٢- محەممەد حەمید ٣- سەعید ئەحمەد ٤- فەوزی رەشید ٥- قادر محەممەد سالح ٦- عەبدولکەریم شارەزا[٥٤] ٧- محەممەد سالح دیلان[٥٥] ٨-

عەبدوڵڵا عەبدولکەریم عەلاف، لەماوەی ئەم(٢٦) ساڵەدا چەند فەرمانبەرو کارمەندی دڵسۆزو چالاکی بووە کە شیاوی ئەوەن ناویان بەڕێزە وەبیری لەوانە بە پلەی یەکەم کاك محەمەد فەتاح کە زۆر دڵسۆزە لە بەڕێوەبردنی کارەکانیا کاك محەمەد حامید قادر برای بەڕێز ئەحمەدحامیدعەبدولرەزاق سەبری خەزووری کاك ئازاد عەبدلواحید، خوشکە شەونم عەبدو کاك ئەژی گۆران‌و چەندین فەرمانبەری خزمەتگوزاری ئەم کتێبخانەیە کە بۆتە مەڵبەندێکی رۆشنبیری گەورە لە شارەکەدا، ماوەتەوە بڵێن هەر بەبەردەوامی رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو کاتە لە سەریان نووسیوە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کردوون‌و باری سەرنجی خۆیان سەبارەت بە هامووشۆی خوێندەواران چی بووە هەررۆژنامەی "ژین" بە ناوی تینووی کتێب‌و ناونیشانی کتێبخانەی گشتی سلێمانی ئەمەی نووسیوە (لە شارێکی کەلاو ئاوەدانی کزی وەکو سلێمانیدا کە جێگای گشتی‌ی بە کەڵکی زۆر کەمە، بەراستی ئەم کتێبخانەیە کە لە بەرێکی ئێجگار پێویستی پڕ کردۆتەوە وەك لەسەردا بۆم دەرکەوت ئەو خوێندەوارانەی کەڵکی لێ وەردەگرن (بەتایبەتی قوتابی‌و لاوەکان) ژمارەیان کەم نی‌یە. لە ئەنجامی پرسێکا بۆم دەرکەوت کە لە سەردەمی مانگی پێشوودا بۆ نموونە (١١٧٣) هاتووچۆکەری بووە، ئەمانە (٧٧) کەسی کتێبی خواستەمەنی یان بردوە ژمارەی کتێب نزیکەی (٣٠٠٠) ئەبێ‌لەمە(١١٣) دانەی کوردی نزیکەی ئەوەش فارسی دوو ئەوەندەش تورکی، کەمێك لەوەش زیاتریش ئینگلیزی‌و پاشاوەکە لە دوو هەزارکتێب زیاتر

عەرەبی‌یە، جێگای خوێندنەوەم کشوماتو پاکو تەمیز هاتە بەرچاو، لە چاو خۆیدا صحی‌وروناك‌و رێك پێکیش بوو)[٥٦] هەر لەم وتارەدا ئاماژە بۆ ئەوەش کراوە کە زیاتر لە پەنجا کورسی هەبووە لە هۆڵی خوێندنەوەدا ... پاشان ناوی چەند گۆڤارێکی نایابی عەرەبی براوەکە لە کتیبخانەکەدا هەبوون لەو کتێبخانانەش دواوە کە بەدیاری پێشکەش کراون.

لە دوا بەشی وتارەکەیدا ئەڵێ:

"لەبارەی خوێندەوارەکانیشەوە هیوامان پی‌یانە تینویەتی‌ی زیاتر بنوێنن بۆ کەڵك وەرگرتن لە جیگایەکی گشتی وا باش کە رابواردنی ئەوێ خۆشترە لە جێگاکانی تری کۆبوونەوەو بەکەڵکتریشە بۆ ژیانی خۆیان‌و گەل‌و نیشتمانیان".

هەروەها دیسانەوە جارێکی ترئاماژەی بەوە کردۆتەوە کە ئامارێکی تەواوی کردووە لەسەر ژماردنی هەموو ئەوانەی بۆ خوێندنەوەی کتێب سەردانی کتێبخانەیان کردووە (لەمانگی تشرینی دووەمدا (١٠٤١) خوێنەر هەبووە (٧٠) کتێبیش خوازراوە هەر بۆخوێندنەوە)[٥٧]. پەیتا پەیتا ژین هەواڵەکانی ناو هۆڵی خوێندنەوەی بڵاو دەکردەوە (لە مانگی رابردوودا – واتەکانوونی دووەم- ژمارەی خوێندەوارانی کتێبخانەی گشتی ١٩٥٧ کەس لەمانە (١٢٧) کەسیان کتێبی خواستوە)[٥٨] هەروەها چەند جارێکی‌تریش وردە ئاگاداری لەم بارە وەبڵاوکردۆتەوەکە هەمووی ئەوە دەردەخەن چەندە بە تەنگ ئەو کتێبخانەیەوە بوە.

(لە مانگی شوباتی رابردووی ساڵی ١٩٥٦ دا ژمارەی خوێندەواران (٨٤٢) کەس بوە لەوانە (٦٠)کچ بون باقی‌یەکەی کورِ[٥٩]). دیسانەوە ئەمجارە مامۆستا نەجمەدین مەلا لەوتارێکدا هەمووی بە ژمارە تۆمارکردون بە ناونیشانی "کتێبخانەی گشتی" (ئەوەتەی کتێبخانەی گشتی لە سلێمانیدا کرابۆوە هێشتاسەرم لێ نەدابوو رۆژی ٤/١١/١٩٥٦ سەر لە بەیانی هەستام چووم سەرپەرشتی کتێبخانە،کاك عەبدولکەریم عارف بە روویەکی خۆشەوە بە پیرمەوە هات بە راستی گەلێ کتێبخانەم دیوە هێشتا کتێبخانەی وا رێك‌ونایابم نەدیوە، بە تایبەتی نەخشەی وێنەی‌زاناو شاعیرو ئەدیبەکانی کە بە دەست دروست کرابون وە بە رێك‌و پێکی لە ژووری خوێندنەوەدا هەڵواسرابورن، لە هەمووی جوانترم هاتە پێش چاو، ئەمەش هۆی تەقەلاو سەلیقەی سەرپەرشت‌و کاربەدەستانیەتی. دوایی کاکی ناوبراو بەم جۆرە باسی چۆنیەتی کتێبخانەی بۆ کردم:

کتێبی عەرەبی (٣١٠٠) لە ئەدەبی‌و کۆمەلایەتی‌و مێژوویی‌و زانستی‌و ئایینی‌و کشتوکاڵی‌و هونەری. کتێبی کوردی /١٢٤/ کتێبی تورکی/٢٤٨/ کتێبی فارسی/ ١٣٩/ کتێبی ئینگلیزی/ ٤٠٦/کتێبی فرانسی/ ٢٩٠ ژمارەی خوێندەوارانی کتێبخانە رۆژی نزیکەی (٣٠) کەسێك ئەبن، لە مانگێکدا نزیکەی (٧٠٠) کەسێك ئەگرێتەوە، بۆ ئەمەش پێویستە زیاتر هەوڵ بدرێ بۆ یاریدەو کتێب کرِین. هەروەها هیوا ئەکەین خوێندەوارانی خۆشەویست لە کتێب پێشکەش کردن بەم

کتێبخانەیە درێخی نەفەرموون. وە لە سەرێکی ترەوە لە کتێبی کوردیدا زۆر کزو نابووتە، ئەمەش تاوانی ئەو نوسەرو زانایانەی کوردە کە کتێب چاپ ئەکەن بۆی نانێرن(٦٠)). ئیتر لەم جۆرە وتارو ئاگاداریو هەواڵ سەبارەت بە کتێبخانەی گشتی سلێمانی وەك وتمان زوو زوو دەنوسرا ماوەیەکی زۆر بوو لە رۆژنامەکانی ئەو کاتەدا هیچ شتێك دەربارەی نەنوسرا تا ساڵی ١٩٦١ ئیتر گۆڤاری رۆژی نوێ بە وتارێك ئەو گۆمی بێ

عەبدوللا عەبدولکەریم عەلاف

دەنگی یەی شڵەقاندو تا ئەو کاتەی کە وتارە کە نووسراوە نزیکەی (١٧) ساڵ بوو جا بۆ ئەوەی بزانین ئەو ئامارە تۆمار کرابوو لەمەو بەر لەگەڵ ئەمە هیچ پێشکەوتنو گۆرانێکی پێوە دیارە! بێگومان بە ئاشکرا ژمارەکان ئەوەمان بۆدەردەخەن کە زۆر لە جاران

پێشکەوتووترو زۆرترن لە هەمان کاتیشدا کاتو ڕۆژی کردنەوەی کتێبخانە دیاری کراوەو تەنانەت ژووری تایبەتیش تەرخان کراوە بۆ خانمان بۆئەوەی خۆتان بەراوردی ژمارەو ئامارەکە بکەن وا دەقی وتارەکە ئەخەمە بەرچاوتان " (کتێبخانەی گشتی سلێمانی لە ساڵی ١٩٤٤ دا کراوەتەوە بە نزیکەی (٥٠٠) کتێبێکو لە شوێنێکی پچووکدا، ئێستە کتێبخانەی گشتی خانوویەکی گەورەی هەیە بەرامبەر مزگەوتی گەورەو هۆڵێکی گەورەی تێدایەو ژمارەی کتێبەکانی گەیشتۆتە (٩٤٧٧) و گۆڤارەکان زیاتر لە (٤٠٠٠)و گەلێ ڕۆژنامەو گۆڤاری بۆ دێت، مێزو کورسی ڕێکو پێکی تێدایە کەلە سەری بخوێنیتەوەو بتوانیت دانیشیت بۆ خوێندنەوە هەموو کاتێك کتێب ئەدرێت بە هەموو خوێندەوارێك بێ جیاوازی تەنها بناسرێت یان دەفتەری نفووسی پێ بێت. هەموو چەشنە کتێبێك لە کتێبخانە چنگ ئەکەوێتوبە هەموو چەشنە کەسێك ئەدرێت بە مەرجێ ئاگاداریبان بکات. ئێستە خوێندەواران زۆر هاتووچۆی کتێبخانە ئەکەنو هیچ مانگێك نییە کە پتر لە (٣٠٠٠) کتێب نەخوێندرێتەوە لە ماوەی ساڵی ١٩٦٠ دا زیاتر لە (١٨٠٠) خوێندەوار هاتوو چۆی کتێبخانەیان کردووە (٧٣١٤) کتێب لە ناوەوەی کتێبخانە گەخوێندراوەتەوە (٧٤١٥) کتێب براوە بۆ دەرەوە. ئەی خوێندەواری خۆشەویست کتێبخانە هەمیشە لە خزمەتتایەو کردنەوەی بەم جۆرەیە هەموو ڕۆژێك بۆ پیاوانو ژنان بێ جیاوازی – ژنان ژووری تایبەتی خۆیان هەیە.

١- بەیانیان لە سەعات-٨- بۆ-١-.

٢- ئێواران لە سەعات -٣- بۆ -٥-.
٣- ڕۆژانی سێ شەممەو عوتلەکان کتێبخانە نییە.
٤-ڕۆژانی هەینی کتێبخانە کراوەیە بەڵام تەنها بەیانیان لە سەعات -٨- بۆ -١- ). [٦١]

لەگەڵ ئەوەشدا کە کتێبخانەکە لە چاو ساڵانی پێشودا زۆر گەورەیە چەندهۆڵێکی خوێندنەوەی تیادایە وەك هۆڵی (پیرەمێرد) بۆ خوێندنەوەی ناوخۆ هۆڵی (گۆران) کە تایبەتە بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانو هۆڵی منالان. بەڵام چونکە ئەمرۆباری ڕۆشنبیری زۆتر لە جاران گەشەی سەندەوەو سلێمانیش گەورەترو دانیشتوانی زۆرتر بون دیارە کە ئەم کتێبخانەیەش پێویستە گەورەترو فراوانتر بکرێ ئەوەتا بەڕێز بەڕێوەبەری کتێبخانەکە لە چارپێکەوتنێکی ڕۆژنامە نووسیدا دەڵێت:

(کتێبخانەکەمان سەرباری پچووکی بیناکەی کێشەی نەبوونی شوێن بۆکتێبە تازەکانو بۆ دۆلاب و شوێنی خوێندنەوەش هەیە). [٦٢]

کە ڕاتە شارێکی گەورەی وەك سلێمانی نەك تەنیا یەك کتێبخانە بگرە پێویستی بە دامەزراوێکی گەورەیە کە بۆی بکرێتەوە تا چەندین کتێبخانەی وەك ئەم کتێبخانەیە سەر بەو دامەزراوەبن.

ڕاستە ئەم کتێبخانەیە لە چاو ساڵانی پێشویدا زۆر پێشکەوتوە لە هەموو ڕویەکەوە بەڵام هێشتا زۆر شتی پێویست ماوە کە بۆی دابین بکرێ ئەوەتا هەر لە هەمان چارپێکەوتنا

بەڕێوەبەری کتێبخانەی گشتی سلێمانی دەڵێت: (مایکرۆفلیم لێرە نیەو ناتوانین بابەتەکان باشتر هەڵبگرین، هەروەها تا ئێستا ئامێری فۆتۆکۆپیمان نی‌یە[٦٣]).

جگە لەوەی کە گەلێ لە جاران دەوڵەمەنترە لە رووی زۆری کتێبو رۆژنامەو گۆڤارەکان هەر کتێب زۆتر لە (٥٠) هەزار کتێبی جۆراو جۆرو هەمەرەنگی تیادایە. جگە لە مانەش چەندین لقی لە شوێنانی جیاجیاکردۆتەوە بۆ ئەمە هەر بەڕێز کاك یاسین قادر بەرزنجی لەو چاوپیکەوتنەدا ئەڵێت: ( بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانەی گشتی سلێمانی چەند لقێکی هەبووە، لقی هەڵەبجەی شەهیدکە دوو جار وێرانو تالانکراوە لە ١٩٧٤و ١٩٨٨ یشدا، زەوییەك هەیە بە ناوی کتێبخانەکەوە بەڵام بیناکەی نەماوەو پێویستە دروست بکرێتەوە. لە ساڵی ١٩٨٩ دا کتێبخانەی قەلادزێ تەختکراوە ساڵی ١٩٩٧ بە شێوەیەك کردمانەوە بەڵام بیناکەی تەواو نی‌یەو پێویستی بەتەواوکردنە.

لقی رانیەمان هەیە هەروەها لقەکانی چەمچەماڵو کفریو کەلار پەیوەندی بە ئێمەوەیە کتێبخانەی دەربەندیخانیش بەم نزیکانە دەیکەینەوە بڕیار وایە بکرێتەوە بەڕێوەبەرێتی هەروەها لە دوای مانگی ئابی ١٩٩٦یشەوە کتێبخانەی (کۆیە)ش خراوەتە سەر ئێمە[٦٤]).

# ١٦-کتێبخانەی ئیستعلاماتی بەریتانی[٦٥]

## یان عەلاقاتی بەریتانی ١٩٤٤- ١٩٤٨

ئەم کتێبخانەیە خەڵکی سلێمانی بەو ناوانەی سەرەوە ناویان دەبرد لە سەرەتای ١٩٤٤ لە خانوویەکی گڵێندا لە جێگەی ئێستای بازاڕی خەفاف کە لە شەقامی "گۆران" ەوە هاموشویان بۆ دەکرد. ئەو کتێبخانەیەی لەوێ بوو بریتی بوو لە چەندین دۆڵاب لە دوو سێ ژوور ریز کرابون، ژوورێکی گەورەش هەبوو تەرخانکرا بوو تەنیا بۆ خوێندنەوە، ئەم کتێبخانەیە لەلایەن دەسەڵاتی بەریتانیاوە دژی دەوڵەتەکانی (محور) وەك ئەڵمانیاو ئیتاڵیاو ژاپۆن دانرابوو، کە بەریتانیا خۆی و ئەمەریکاو رووسیاو فەرەنسەو هاوپەیمانەکانیان لە جەنگی جیهانی دووەمدا بوون بەرامبەر دەوڵەتەکانی (محور) لەبەر ئەمە هەرچی لەم کتێبخانەیەدا بوو بە گۆڤارو رۆژنامەو کتێبەوە لە خزمەت راگەیاندنی دەوڵەتە هاوپەیمانەکاندا بوو دژی هیتلەرو دەوڵەتەکانی (محور) کتێبخانەکە سپێردراو بوو بە (عەلی حاجی مەلا شەریف). ئەم کتێبخانەیە هەر بۆ کتێبو گۆڤارو رۆژنامە خوێندنەوە بوو، فرۆشتنی تیادانە بوو، خۆئەگەر کەسیش ناسراو بوایە بیویستایە کتێب بخوازێ بۆ دەرەوە پێی ئەدرا نامیلکەو پۆستەرو راگەیندنی نوسراو وێنەش هەرچی کە پەیوەندی بە راگەیاندنەوە بوایە بە خۆرایی دەبەخشرایەوە بەسەر

خوێندەوارەکاندا. یەکێك لە چالاکیەکانی بۆ پڕوپاگەندە کردن دامەزراندنی ئیستگەیەکی رادێوی ناوچەیی بوو، بلّند گۆیەکی گەورەش لەبەر دەرکی سەرا هەلّواسابوو خەلّکانی ساویلکەو نەخوێندەوار گوێ گری دەنگو باسەکانو راگەیانەکانی بوونو لیێ کۆئەبوونەوە.

لە کۆتایی سالّی ١٩٤٨ دا ئەو کتێبخانەیە گواستیەوە بۆ خانویەك لە گەراجی خوالیێخۆش بوو (حەمەیفەرەجە فەنی) کە ئێستاش ئەو گەراجە ماوە لە شەقامی بێکەس ئەچێ بۆ مزگەوتی گەورە بەرامبەر هەردووسینەمای سیروان رەشید تەنیشت کۆلانی مزگەوتی ئەوقاف. ئەو کاتە بوو جەماوەری خەلّکی عێراق لە هەموو لایەکەوە خرۆشابونە سەر شەقامەکانی شارەکانو خۆپیشاندانو بەگژا چونەوەی مۆرکردنی پەیمانی شوومی (پورتسموث) ئەکرا دژ بە گەلانی عێراق بۆیە هەر هەموو لە هەلّچوونو هەلّمەت بردنا بون ئەم راپەڕینو هێرش بردنەی سالّی ١٩٤٨ بەراپەڕینی سەرانسەری گەلانی عێراق ئەژمێردرێ لە مێژووی نوێدا لە زۆر شوێن هێرش ئەبرایە سەر دامو دەزگاکانی ئەوسای ئیستخباراتی بەریتانی لە شاری سلێمانیش ئەو کتێبخانەیە لە چنگی جەماوەری راپەریو قوتار نەبوو لە هەموو لایەکەوە هێرش برایە سەری هەرچی تیا بوو سوتاندیان بەمە کۆتایی بەو کتێبخانەیەش هێنرا.

# ١٧-کتێبخانەی بیری نوێ

## بەهاری ١٩٤٦ - ١٩٤٧

شەهید کەریم سۆفی

ئەم کتێبخانەیە لە شەقامی مەولەوی لە گۆشەی خوارەوەی بازاڕی دەبۆکەی ئێستا لە لایەن چەند کەسانێکی ئەندامی حزبی (تحرر وطني) سەر بە حزبی شیوعی عیراق کە بریتی بوو لە شەهید کەریمی سۆفی[٦٦] وە هونەرمەند مامۆستا عومەر عەلی ئەمین خوالێخۆشبوو ئەحمەد غەفور ئەنوەری حەماغا بەبێ پرس و

مامۆستا عومەر عەلی ئەمین

مۆڵەت وەرگرتن دا[illegible] [illegible] [illegible] [illegible] [illegible] سۆزی بوو (ئەم کتێبخانەیە ژمارەی کتێبەکانی لە (١٠٠) کتێب تێپەڕی نەئەکرد لەسەر سێ چوار ڕەفەی بە دیواردا کوتراو ڕیز کرابوون ، زۆربەی کتێبەکانیش چەپڕەو و پێشکەوتنخوازی بوون هەمووشی لە لایەن لایەنگرانی حیزبەوە پێشکەش کرابوون مەبەستیش لەم کتێبخانەیە هەر خوێندنەوە بوو نەك کتێب فرۆشتن .. دوو قەنەفە و کورسی و مێزێکی لێ دانرابوو بۆ خوێندنەوە هەرکەسێکیش کتێبی بخوازیایە بۆ دەرەوە پێیان ئەدا تەنانەت کتێبی دایك هی ماکسیم گۆرکی کە عەرەبیش بوو دەستاو دەست بە مەرجێ دانەیەکی لێ بنووسێتەوە ئەیاندا بەو کەسانەی ئارەزووی خوێندنەوەی بوو. بەڵام

ڕۆژنامە کەم بوو لە بازاڕ یەك دوو ژمارە لەو ڕۆژنامانــە دەکــڕان و دایان ئەنا بۆ خوێندنــەوە ئــەو ڕۆژنامانــەش ئەمانــە بــوون (صــوت الاهالی) و (صوت الاحرار) و (وطن)[٦٧].

ئــەم کتێبخانەیــە بــوو بــە بنکــەی چاوپێکــەوتن و ئــالۆگۆڕکردنی ڕاو بۆچوونــەکانی ئــەندامانی حزبــی (تحــرر - حزبی شیوعی) لــێرە بــاس و خــوازی خۆیــان بــە یــەکتر دەگەیاند .

ئەحمەد غەفور

ئەوانەی زۆرتر لەوێ ئەبینران ئەنوەری حەماغا نــوری عــەزیز ئەحمەدی شێخ حەسەن و عومەر عارف دوو سێ لاوی تــری ئەوســا خوێندکار بوون و ناو بەناو سەردانی ئەم کتێبخانەیەیان ئەکرد وەك غەفوری میرزا کەریم ئەکرەم عبدالقادر یامولکی و مەحمود بەگ لە دواییشدا کۆچکردوو ڕەفیق چالاك لەوێ ئەبینران خوێندواران و ڕۆشنبیان و نیشتمان پــەروەرانی ئــەو دەمــە دیــانزانی کــە (ئــەم کتێبخانەیە سەر بە چ لایەنێکە)[٦٨] ، ئەو کاتە ڕژێمــی پاشــایەتی بەرهەڵستی و دژی هــەمــوو جــۆرە بیروبــاوەڕێکی پێشــکەوتووخوازو

ئازادی ڕادەربڕین بوو کە زانیاری تەواوی دەست کەوت لەسـەر ئـەم کتێبخانەیە هەر لە هاوینی ساڵی ١٩٤٧ دا دەسـتی گـرت بەسـەر کتێبخانەکەدا و کۆتایی پێهات .

# ١٨- کتێبخانەی رووناکی

## سەرەتای ١٩٤٧ تا کۆتایی ١٩٤٧

ئەم کتێبخانەیە لە شەقامی مەولەوی بوو، لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٧وە لەلایەن جەمال عەبدوڵڵاوە دامەزرا بێ ئەوەی مۆڵەتی یاسایی بۆ وەرگرێ.

دوای ئەوەی لە مێژوی کتێبخانەکانی سلێمانی بوبومەوە رەزامەندی وەزارەتی رۆشنبیریم وەرگرت بۆ لە چاپدانی، دوای کۆمپیوتەر کردن برای رۆشنبیرو خۆشەویستم (سدیق ساڵح)(٦٩) وەك مژدەیەك کۆمەڵێ بەڵگەنامەی خستە بەردەستم لەسەر کتێبخانەی رووناکی کە من پێشتر ئەو زانیارییەم لانەبوو، ئەو بەڵگەنامانەش تایبەتن بە (ئەرشیڤی نەتەوەیی کوردستان) لە وەزارەتی رۆشنبیری.

جا دوای وەرگرتنی رەزامەندی بەرێز سەرۆکی باڵای ئەرشیڤی نەتەوەیی کوردستان مامۆستا شێخ محەمەد شاکەلی وەزیری رۆشنبیری رێم پێدرا کە هەندێك لەو بەڵگەنامانە فۆتۆکۆپی بکەم بۆ زیاتر زانیاری تەواو لەسەر کتێبخانەی رووناکی لێرەدا جێی خۆیەتی رێزو سوپاسێکی زۆری مامۆستا شاکەلی و برای رۆشنبیرو خۆشەویستم کاك سدیق ساڵح بکەم بۆ هاوکاری کردنیان لە ئەنجامدانی کارەکەمدا.

بەڵێ "دوای کردنەوەی ئەم کتێبخانەیە بە چوار مانگ جەمال عەبدوڵڵا کە دامەزرێنەرو هەڵسوڕێنەری بووە دەیفرۆشێتەوە بە

محەمەد فوئاد مـەجید ناوێك کە ( مضمد )بووە لـە فەرمانگـەی تەندروستی قوتابییانی ئەوسا بەبڕی (٥٠) دینار بە هەموو کتێبو شتەکانەوە" (٧٠)

ڕۆژانـە ئاسـایشو پۆلیـس ئەگـەڕان بـە دوای تێکۆشـەرانداو بـە هەمیشەش پشکنینو گەڕان بە دوای بەیاننامەو کتێبو ئەو جۆرە شتانەداکە بۆنی پێشکەوتنخوازیو بیرو باوەڕی ئـازادی لێبێـت بـە تایبەتیش کتێبە قەدەغەکراوەکان وەك نوسینەکانی کارل مارکسو ئەنجلسو لینینو ستالین هتد بویە لە هەڵمەتی گـەڕانو پشـکنیندا لە کتێبخانەی ڕووناکی هیچ شتێکی لەو بابەتانە نە دۆزابۆوە بەڵام ئاسایش بە وەرنەگرتنی مۆڵەتی یاسایی ئەو کتێبخانەیان زانیـوەو لـە کۆتـایی ١٩٤٧ تـا داخـرا. بـە پـیّ ئـەو بەڵگـە نامانـەی لەبەردەستماندایە بە مێژووی ١٩٤٨/١٢/٢١ لە ناو پۆستەی ئەو کاتەدا کۆمەڵێ کتێب ئەگیرێ کە ئەمانە بوون (منافع الشیوعیة العمل بالاجرة وراس المال ذکریات ماکسیم گۆرکی) لە نـاوەوەی لاپەڕەکان بە دەستنووس چەنین ڕستەو واتا نوسراوەتەوە لە هـەمان کاتیشا لەسەر بەرگی کتێبی (مذکرات ماکسیم کورکی) مۆرێـك لێ دراوە کـە مـۆری کتبخانـەی ڕووناکی‌یە. ئـەم کتێبانـە نـەناوی نێردراوی بەسەرەوەیەو نەئەوەی بۆی ڕەوانـەکراوە بـەڵام ئـەو مـۆرەی کتێبخانـەی ڕوونـاکی ئـەبێ بەبەڵگـەی گـەڕان لـە دوی خـاوەن کتێبخانەکەکە ساڵێك لەوەو بەر داخراوە بۆیـە لـە ١٩٤٩/١/١١ دا محەمەد فوئـاد مـەجید ئـەگیرێو ئەکەونـە لێکۆڵینەوە لەگـەڵیا ئەوەیش لە وەڵامدانەوەیدا ئەڵێ من لە نێوان ساڵی ١٩٤٧ دا ئـەم

کتێبخانەیەم لە جەمال عەبدوڵڵا کڕیوە هیچ لەم کتێبانەی ئێوە ئەیڵێن تیایا نەبوە بە ناوبردنی جەمال عەبدوڵڵا ئەویش ئەگیرێ‌و لێکۆڵینەوەی لەگەڵا ئەکەن ئەمیش نکوڵی ئەکات‌و ئەڵێ هیچ مۆرێکم نەبوە کاتێ ئەم کتێبخانەیە هی من بووە بەڵام بەمانە واز ناهێنن دەستخەتی هەردووکیان محەمەد فوئاد مەجیدو جەمال عەبدوڵڵا وەرئەگرن ئەی نێرن بۆ بەشی هونەری پۆلیس لە رەسافەی بەغداد لە ئەنجامدا دەرئەکەوێ کە خەتی هیچ کامیان نیە. ئیتر هەیەکەو بەبارمتە ئازاد ئەکرین محەمەد فوئاد مەجید بە بڕی (١٠٠) دینارو جەمال عەبدوڵڵا (١٥٠) دینار کتێبخانەکان ئەو کاتەو تا سەردەمی راپەڕینیش بەم شێوەیە رەفتاریان لەگەڵدا کراوە.

# ١٩- کتێبخانەی کوردستان

**١٩٤٨**

ئەم کتێبخانەیە لە شەقامی مەولەوی بوو بەرامبەر کۆشکی تۆفیق قەزاز پارێزەر کەمالی میرزا کەریم دایمەزراند هەر ئەو ساڵەش پێچراوەتەوەو ناوی نەما .

# ٢٠- کتێبخانەی یەکێتی

**١٩٤٩**

شوێنی ئەم کتێبخانەیە نەزانرا بەڵام ئەوەمان بۆ ساغ بووە کە لە لایەن (مەدهۆش)[٧٢] و (شێخ حەسەن شێخ حەمە مارف)[٧٣]ەوە دامەزراوە دیسانەوە کاتی داخستنی نازانرێت .

مەدهۆش

شێخ حەسەن شێخ حەمە مارف

# ٢١- کتێبخانەی سەرکەوتن

**١٩٤٨**

ئەم کتێبخانەیە لە شەقامی مەولەوی بوو لە ساڵی ١٩٤٨ دا دامەزراوە بەرامبەر بە دەبۆکەی ئێستا ، هەردوو برا جەمال عەبدوڵڵاو لەتیف عەبدوڵڵا بۆ بژێوی ژیانی رۆژانەی خۆیان و بازرگانی دایان ناوە ئەم کتێبخانەیەش بەر ئەو راماڵینە کەوت کە رژێمی پاشایەتی کەوتە داخستنی رۆژنامەو گۆڤارو کتێبخانەکان وە هەر لەو ساڵەدا پێچرایەوەو نەما .

## تەم و مژێکی ئاڵۆز

لەساڵانی ١٩٤٨دا تا ١٩٥٠ چەند کتێبخانەیەك هەبوون هەرزوش نەمان، نیبیاریەکی وامان دەست نەکەوت لەبارەیانەوە ئەگەرچی لەزۆر نووسەرو رۆشنبیرو شتمانپەروەری ئەو رۆژگارەشمان سۆاخ کرد شتێکی ئەوتۆیان لانەبوو لەسەر دامەزراندنو ەمانی ئەو کتێبخانانە. بەڵام ئەوەی جێی سەرنجەو ئاشکراشە رژێمی پاشایەتی ئەوسا ریەکدەو ساڵەدا بەتایبەتی ساڵی ١٩٤٨ کە پەیمانی (پۆرتسموث)ی مۆر کرد ، بەجارێ ەلانی عیراقی لێ وورژاو لەهەموو شارەکانیەوە بەگژا چوونو راپەرینو خۆپیشاندان دەستی ێ کرد. ناچار رژێم لەتۆڵەی ئەو هەڵمەتو راپەرینەدا کەوتەراونانو گرتن، بەهەزاران نیشتمانپەروەرانی رەوانەی زیندانەکان کردو پری کردن لە تێکۆشەرانو دڵسۆزان. ەریەمەش نەوەستا کەوتە داخستنی هەمو. ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەی ئەوسا دەردەچۆن. رەدا ئەوەی مەبەستمە تیشکێك بخەینەسەر ئەم تەمو مژە ئاڵۆزییەی ئەو رۆژگارە کەبۆ ئەو تێبخانانە نەماون دیارە ئەمانیش هەروەك رۆژنامەکان لەژێر ئەو پاڵەپەستۆیەدا بوو، رئەو هۆیەش بوو بۆ داخستنیان .

# ٢٢- نامەخانەی گەلاوێژ

## پاشان بوو بە کتێبخانەی گەلاوێژ ١٩٥٠ - ١٩٨٩

دامەزرێنەرو هەڵسورێنەرو لێپرسراوی ئەم کتێبخانەیە (رەئوف مەعروف فەتاح) ە لە ساڵی ١٩٢٩ لە شاری سلێمانی لە دایك بووە وەك لاوێکی خوێن گەرم چۆتە ناو ریزەکانی (پارتی کۆمۆنیستی عیراق)وە ئەندامێکی چالاکی ئەو پارتە بووە رەئوف مەعروف فەرمانبەر بووە لە فەرمانگەی تەندروستی ئەوسادا پاشان دوکانێکی کردۆتەوە بابەتی (عەترو قۆلۆنیاو بۆینباخ و کراس و

پانتۆل و ئەو بابەتانەی تیادانارەو ناوی ناوە (کۆگای گەلاوێژ)و لە ساڵی ١٩٥٠ وە هەموو ئەو شتانەی لابردوو بەهەر چواردەوری ناوەوەی دوکانەکەیدا رەفەی رێك و پێکی لە شێوەی کتێبخانەیەکی

سەردەم و رازاوەو جوان درووست کرد ، دوکانەکەی لە سەرەتاوە یەك دوکان بوو بەڵام لە کۆتای شەستەکاندا دوکانێکی تری خستە سەر کتێبخانەکەو بە جارێ گەورە بوو ناوی نامەخانەی گەلاوێژی بۆهەڵبژارد لە سەرەتای شەستەکاندا ناوەکەی گۆڕی و لە پێشەوە لەسەر دوکانەکەی بە درێژایی هەردوو دوکانەکە بە نووسینێکی جوان ناونیشانی نامەخانەکەی کردە (کتێبخانەی گەلاوێژ) و لە ژێریا ساڵی دامەزراندنی ١٩٥٠ ی لەسەر نووسرابوو .

ئەم کتێبخانەیە لە دوای کتێبخانەی گشتی سلێمانی بە پلەی دووهەم دەوڵەمەندترین کتێبخانەی ئەوسای سلێمانی بوو هەموو ئەو چاپکراوانەی دەردەچوو لێرە دەست دەکەوت هەر هەموو رۆژنامەو گۆڤارەکان رۆژانە لەم کتێبخانەیە هەبوو جاروبار رۆژنامەو گۆڤارەکانی میسر و ئەردەنیش لای هەبوو .

کتێبخانەکەی وەك پورەهەنگ وابوو هەمیشە پڕ بوو لە نووسەرو شاعیرو رۆشنبیرو نیشتمان پەروەران وتوویژو باسوخوازی سیاسی و ئەدەبی و مێژوویی مشت و مڕی لەسەر ئەکرا ئەوانە لەوێ ئەبینران ماموستایان ، رەفیق حیلمی مستەفا ساڵح کەریم محەرەم محەمەد ئەمین عومەر عارف دیلان کامەران زۆر لە رۆشنبیرانی تر وە نەبێ ئەم کتێبخانەیە لە هێنانی کتێب و رۆژنامەو گۆڤار چالاکی تری نەبووبێ ، بەڵکو لەگەڵ ئەم خزمەتکردنە کەوتە چاپکردنی زنجیرەیەك کتێب لە هەمان کاتا نووسەران و شاعیرانی ئەوکاتەو تا ئێستاش لە چاپکردنی

بەرهەمـەکانیانا توانـای بـە چاپگـەیاندنیان نـەبووە بۆیـە ئـەم کتێبخانەیە هەڵسا بە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی کتێبی نایاب :-

١-چۆن فێری ئینگلیزی ئەبی ؟/ عەبدوڵڵا شـاڵی / ١٩٥٥ بەغداد چاپخانەی دار النشر للطباعة (٤٠) لاپەڕە

٢- صلاح الدين و فێڵی بەنکێشەکان / و / لە عەرەبییـەوە / أ - ب هەوری / ١٩٥٧ بەغداد چاپخانـەی مـەعاریف (١٥٦) لاپەڕە.

٣- خانزاد جەمال بابان / ١٩٥٧ بەغداد چاپخانەی تەمەدون (٥٦) لاپەڕە.

٤- کـاروان /محەمـەد سـاڵح سـەعید / ١٩٥٧ بـەغداد چاپخانەی سلمان ئەعزەمی (٦٠) لاپەڕە.

٥- دیاری ، کامەران /١٩٥٧ بەغداد چاپخانـەی مـەعاریف (٨٤) لاپەڕە.

٦- دیوانی حەمدی (ئەحمەد حەمدی سـاحیب قـڕان/ ١٩٥٧ بەغداد چاپخانەی ئەسعەد (٣٩٩) لاپەڕە.

٧- شـانازی / کامـەران / ١٩٥٨ سـلێمانی چاپخانـەی کامەران (٨) لاپەڕە.

٨- شـێخ مـەحمودی زینـدوو / دیـلان / ١٩٥٨ یـەغداد چاپخانەی تەمەدون(٥٩) لاپەڕە.

٩- یادی گۆڕستانەکە / دەستۆفسـکی / و /محرەم محەمـەد ئەمین ١٩٥٨ بەغداد چاپخانەی لیوا (١١٢) لاپەڕە.

١٠-ديوانی سەلام / شێخ سەلام عازەبانی ١٩٥٨ بەغداد چاپخانەی تەمەدون ٢٠٤ لاپەڕە .

١١- زووڕداری تاوانبار / فوئاد عیزەت / ١٩٥٨ سلێمانی چاپخانەی کامەران (١٨) لاپەڕە .

١٢- کامەران و هۆنراوەی نوێ / محەمەد سدیق عارف / ١٩٥٨ بەغداد چاپخانەی مەعاریف (٦٦) لاپەرە)

١٣- رێزمانی کوردی ، نوری عەلی ئەمین / ١٩٦٠ سلێمانی چاپخانەی کامەران ٢١٨ لاپەڕە .

١٤- رێباز / لە شێوەی گۆڤارێکدا / ١٩٦٨ سلێمانی چاپخانەی ژین (٧٤) لاپەڕە .

ئەم کتێبخانەیە تا ساڵانی ١٩٨٩ هەر رەئوف مەعروف بە رێوەی ئەبرد ئیتر ئەویش رووی کردە هەندەران و (ئێستا لە لەندەنە) کتێبخانەکەش نەماو کتێبەکانیش فەوتان .

# ٢٣- کۆگای سرۆچك

١٩٥٢ -١٩٦٥

شەقامی مەولەوی لە سووچێکی خوارەوەی بازاڕی دەبۆکەی ئێستا کە لەوێوە ئەچێت بۆ ناو بازاڕ خوار یەك دوو دوکانی کوتاڵ فرۆش لە گۆشەیەکداو بە یەکدوو پیپلیکانە بۆی سەر ئەکەوی دوکانێك لە سەرەتای پەنجاکانەوە ساڵی ١٩٥٢ لێی نووسرابوو (کۆگای سرۆچك خاوەنی عوسمان تۆفیق بوو) ئەم کۆگایە زۆرتر بابەت و پێداویستیەکانی خوێنکارانی لا دەست دەکەوت .

عوسمان تۆفیق پیاوێکی راستگۆ و دڵسۆزو خوو ڕەوشت بەرز بوو هەر لە خۆشەویستی کوردو کوردستان باوەشێنی هێنابوو کە لە کارگە بە چاپکراوی لە سەری نووسیبوو بە خەتێکی جوان ( باوەشێنی کوردستان) دیسانەوە لە گەڵ ئەوەشدا ماکینەی دوورومانی هێنابوو کە ئەویش هەر بە هەمان شێوە لە کارگە بە چاپکراوی لە سەری نووسرابو "کوردستان" ئەو وشەی کوردستانە بۆ ئەو کاتە شتێکی تا بڵێی دڵخۆشکەرو بزوێنەری تاخی کوردایەتی بوو ، بۆیە ئەم پیاوە لای دانیشتوانی شارەکەی رێز لێگیراوو خۆشەویست بوو لە گۆشەیەکی دوکانەکەی تاقێکی جوانی رازاندبۆوەو کۆمەڵێك کتێبی تیادا بوو کە هەر هەمووی کوردی بوون وەك دیوانی شاعیرەکان و شیعرو ئەدەبیاتی کوردی رەفیق حیلمی و مێژووی ئەدەبی کوردی هتد .... لەگەڵ زۆر لە ژمارەکانی گۆڤاری هیواو هەتاودا جگە لەماتەش هەموو

هەفتەیەك رۆژنامەی ژینی بۆ ئەهات تا بلاوی بکاتەوە . لەبەر ئەوەی شوێنەکەی ناوبازاڕو چەپەك بوو کەمتر رۆشنبیران هاتوچۆیان ئەکرد بەلاّم زۆرجار مامۆستا جەمال عەبدول لەوێ ئەبینرا . تا سالآنی ١٩٦٥ ئەم کۆگایە بەم شێوەیە مابوو بەلاّم لەوەو دوا نەماو ئێستا خەلکی تر لەو شوێنە کاسیی ئەکەن.

# ٢٤-دوکانی ئەژی گۆران

## ١٩٥٤ - ١٩٥٦

لە شەقامی کاوە چەند دوکانێك خوار (عومەری ئەجێ) ی کەبابچی دوکانێك دانرابوو بۆ فرۆشتنی پێداویستیەکانی خوێندکاران ، جگە لەمەش هەندێ کتێب و هەموو رۆژنامەکانی ئەو کاتەی دانابوو کە لای رەئوف مەعروفەوە وەری ئەگرتن ئەم دوکانە لە لایەن کوڕانی (گۆران) ی شاعیرەوە دامەزرابوو . کە هەردوو برا ئەژی گۆران[٧٤] هۆگر گۆرانی برای[٧٥] پێکەوە بەڕێوەیان ئەبرد یەك دوو ساڵ بەم جۆرە مایەوەو پاشان پێچایانەوەو نەما.

# ٢٥- کتێب فرۆش مەحمود خاکی ١٩٥٤

## یا کتێبخانەی مەولەوی ساڵی ١٩٦٨ که پاشان بوو بە کتێبخانەی خاکی تا هاوینی ١٩٩٠

خوالێخۆشبوو مەحمود خاکی پیاوێکی رەقەڵەی لاوازی چاو پڕپووشاوی که هەمیشە چاویلکەیەکی گەورەی ڕەشی لە چاوا بوو ، بەڵام گورج و چست و چالاك و بزێو دڵپاك و رووخۆش و دەم بە پێکەنین ، ساویلکەو خۆش باوەڕ ، دڵسۆزو بە ویژدان و کورد پەروەر.

لە سەرەتای پەنجاکانەوە ئەم پیاوە بۆ بژێوی ژیانی رۆژانەی خۆی و دایکێکی پیری هەموو ئیشێکی ئەکرد کۆڵ هەڵگربوو لەناو بازاڕو بەرگەراجەکان و بەسەربەرزیەوە ئەژیا. لە ساڵانی ١٩٥٤ بوو بە فرۆشیاری دەستگێڕی رۆژنامەی ژین بەناو بازاڕدا هەمیشە چەپکێ رۆژنامەی (ژین) ی لەبن دەستا بوو بە کووچەو شەقامەکانی شاردا هاواری ئەکرد نوێترین رۆژنامەی ژین بخوێنەرەوە.

بەم شێوەیە تا ساڵی ١٩٥٦ ، ئیتر گۆڤاری هەتاریشی هاتە پاڵ و لەبەردەم نەخۆشخانەی خوارەوەی ئەوسای سلێمانی کە ئێستا بۆتە گراجی وەستانی ئۆتۆمبێل بەرامبەر بازاڕی زانکۆ لەسەر شۆستەکە دای ئەنان و بۆخۆشی لە سوچێکدا بە دیاریانەوە هەڵئەتروشکا جارویاریش شوێن گۆڕکێی بۆ ئەکرد بەڵام هەر لە

مەحمود خاکی

دەوروبەری بەر دەرکی سەرا بوو بووە برادەری شۆستەکان. لە نێوان شەستەکاندا بە تەواوی هاتە بەر دەرکی سەراو لە پاڵ دیواری بەریدی ئەوسا تەنیشت حاجی عەلی سەعاتچی کە کاتی خۆی ئەم دوکانە لە چلەکاندا شوێنی کتێبخانەی ئازادی بوو خوالێخۆشبوو مەحمود ئەحمەدو محمد خدر کۆیی بەڕێوەیان ئەبرد ، ئیتر لەم پاڵ

دیوارەدا جێگیر بوو بەڵام هەر لەسەر شۆستەکە هەندێ کتێب و گۆڤاری ریز ئەکرد هەمو رۆژ چاودێرەکانی شارەوانی ئەهاتن و پێیان کۆئەکردەوە ناچار خاکی بیری کردەوەو چەند تەختەیەکی گەورەی پانی دروست کردو تولی باریکی درێژ لەم سەر تا ئەوسەری لێداو هەموو کتێب و گۆڤارەکانی بە شێوەیەکی جوان لەسەر ریز کردن و پاڵی دان بە دیوارەکەوە بەم شێوەیە لە مەترسی پێ لابردنی شارەوانی رزگار بوو ، کتێبەکانی بریتی بوون لەو کتێبە نوێیانەی دەرئەچوون وازی لە رۆژنامە فرۆشتنیش هێنا تا عەرەبانەیەکی لە شێوەی سندوقێکدا بۆ دروست کردو چوار بۆلبەرینی خستە ژێر ئێواران کۆی ئەکردەوەو ئەیکردە عەرەبانەیەکەوە کە ئەویش بە قفلێکی گەورە دائەخراو بە پاڵ بۆ ئەوبەر بۆ بازاڕی عەسری و لەناو بازاڕەکەش بە یەکێك لە قفلی دوکانێکەوە ئەیبەستەوە تا بەیانی بەم جۆرە ئەم کتێبخانە بچکۆلە گەڕۆکەی ئەهێناو ئەبرد جگە لەو کتێبە نوێیانەی وتم دەیان چاپکراوی چاپخانەی (ترقی) حەمە ئەمین عەسری لە کەرکوکەوە بۆ ئەهات کە بریتی بوو لە کتێبە فۆلکلۆری و ئاینی و ئەفسانەکان وەك ئەمیر ئەرسەلان و فەتحی قەڵای خەیبەر و (چل طوطی) هتد. مەحمود خاکی خۆشەویستی هەمووان بوو زۆر زۆر رۆح سووك بوو لە یەکەم بینینا ئەچووە دڵەوە بۆیە هەر شاعیرو ئەدیبێك بەرهەمی چاپ بکردایە یەکەم کەس کە بۆی بڵاو بکاتەوە ، مەحمود خاکی بوو پاشان بۆ لای گەورەترین کتێبخانەی ئەو

سەردەمەی گەلاوێژ ئەبرا خوا هەڵناگرێ رەئوف مەعروفیش درێغی لە یارمەتی دانی نەئەکرد هەموو کتێبێك داوای کردایە ئەیدایە.

ئەم کتێبخانە هەڵواسراوەی مەحمود خاکی بە دیوارا هەموو گۆڤارەکانی هیواو رۆژی نوێ و شەفەق و بلێسەو نەورۆزو جاروباریش گەلاوێژی لا دەست ئەکەوت خوالێخۆشبوو گیوموکریانی یەکەم باوەڕ پێکراوی بۆ بڵاوکردنەوەی چاپەمەنیەکانی لە سلێمانی مەحمود خاکی وەك دەزگایەکی بچووکی بڵاوکردنەوەی چاپکراوی کوردی وابوو جگە لەمەش بۆخۆشی کەوتە چاپ کردنی کتێب و زنجیرەیەکی چاپو بڵاو کردەوەو لەوانە:

١-هەمیشە بەهار، مەدهۆش —١٩٦٥ سلێمانی .

٢- دڵی کچان مەدهۆش /چاپی یەکەم ١٩٦٧ بەغدا چ . سەلمان ئەعزەمی (٥٠) لاپەڕە.

٣- دیوانی حەریق مەلا صاڵح / حریق /١٩٦٨ بۆ جاری دووەم کەرکوك چ . جمهوری (٩٢) لاپەڕە.

٤- لەیلو مەجنون مەلا فەرەج ساڵح / شەکیبی شاعیر ١٩٦٩ سلێمانی چ . راپەڕین (١٣٨) لاپەڕە.

٥- گردی شەهیدان/ محەرەم محەمەد ئەمین / ١٩٧٠ سلێمانی چ . کامەرانی (١٦) لاپەڕە.

٦- دیوانی وەلی دێوانە(١٩٧٠) سلێمانی چ. کامەرانی (٨٠) لاپەڕە .

٧- دڵداری و پەیمان پەروەری / ئەبوبەکر شێخ جەلال / أ.ب هەوری/ ١٩٧١ چ. دووەم سلێمانی چ کامەرانی (٤٦) لاپەڕە.

٨- دڵی کچان /شیعری /مەدهۆش.

مەحمود خاکی سەرەڕای ئەم کارانە لەبەردەم کتێبخانەکەیدا وەك قوتابییەکی ئەلقە لە گوێی گوێڕایەڵی مامۆستای کۆچ کردو بەشیر موشیر هەمیشە سەرقاڵی کوردایەتی بوو تەنانەت باجی ئەو راستگۆیەشی دایەوەو لەسەر زمان درێژی و بڵاوکردنەوەی چاپەمەنیەکانی شۆڕش و بەیاننامەکانیان تووشی خۆشاردنەوە بوو بەڵام شێخ ئەنوەری شاعیر گیرا ، هەرچی کتێبی هەبوو لە دەردوەو ماڵەوە هەمووی گیراو فەوتا بەڵام خاکی لەسەر ئەو رێبازە پیرۆزەی رەحمەتی لای نەداو لە تێکۆشاندابوو بۆیە زاناو رۆشنبیران و ئەدیبان سەریان لێ ئەدا لەوانە: (دیلان ، کامەران ، محەرەم محەمەد ئەمین ، شاکیر فەتاح عەلادین سجادی) ئەوانەش کە هاموشۆیان ئەکرد هەمیشە لای دائەنیشتن (مەدهۆش ، مامۆستا عومەر مەعروف بەرزنجی ، رەفیق سابیر ، جەزا عەلی ئەمین سەباح غالب کەمال میراودەلی و ساجید ئاوارەو شەهید دلشاد مەریوانی و رووف حەسەن، ئەحمەد حسین ، حەمە سەعید حەسەن ، جەمال شارباژێری) هەرکاتێکیش عەبدوڵڵا پەشێو سەردانی سلێمانی بکردایە یەکەم کەس مەحمود خاکی بوو ئەوانەش کە سەریان ئەکردە سەری سەباح غالب عبدوالڕەزاق پشدەری جەزا عەلی ئەمین بوو هەرچییشی بووتایە ئەخرایە سەرچاو ،ساڵی ١٩٦٧ چەند کتێب فرۆشێکی تر هاتنە پاڵی و وەك ئەم بە هەمان شێوە کتێبەکانیان دانا (جەمال محەمەد ئەمین ، مارف ناسراو ، شێخ ئەنوەری شاعیر) تا ساڵی ١٩٦٨ ئیتر لەگەڵ جەمال محەمەد ئەمین رێك کەوتن بە

دوو قۆڵی کتێبخانەیەك دامەزرێنن لەناو بازاڕی عەسری لەتە دوکانێکیان گرت و مۆڵەتی یاساییان وەرگرت و ناویان نا (کتێبخانەی مەولەوی) مەحمود خاکی هەرزوو وازی هێناو جیا بۆوەو ڕووی کردە گازینۆی شەعب و لە گۆشەیەکی بچووکی ئەوێدا کتێبخانەی دانا تا شالاّوی ئابلۆقەکانی شاری سلێمانی (١٧/١٠/١٩٨٥ ڕاگەیانراو گرتن و کوشتن دەستی پێکردەوە کەوتنە پشکنینی مالاّن مەحمود خاکی یەکێك بوو لەو مالاّنەی بە سەدان کتێبی دەرەوەی تیا دابوو بە تایبەتی (کۆمەڵە) کە لە سەری گیراو درا بە دادگا لە رۆژی ٢٧/٤/١٩٨٦دوای ئەو ماوە زۆرە دە ساڵ زیندانی بۆ بڕایەوە لە ئەبوغرێب لە جەمەلۆنی یەك کە ئەوسا گیراوە سیاسی‌یەکان لەوێ توند ئەکران خاکیش وەك خەباتگێڕێکی گۆشکراوی مامۆستا بەشیر موشیر خرایە ئەو زیندانە تا بۆ ئێوارەکەی لێبوردنی گشتی دەرچوو، کاتژمێر (٨) کە مەحمود خاکیشی گرتەوە بەلاّم تا (١٧/٥/١٩٨٦ ئازاد نەکرا.

کاتێکیش ئازاد بوو هاتەوە سەر کتێبخانە خنجیلانەکەی کەمێك ئازارو ئەشکەنجەی زیندانی پێوە دیاربوو وەکجاران بە کەیف و روخۆش نەئەهاتە بەرچاو لە هاوینی ساڵی ١٩٩٠ ماڵئاوایی لە کتێبخانەی کوردی کرد بە کارەساتێکی دڵتەزێن و لەناومانا نەما ، بەلاّم هەمیشە .... قوتابی مامۆستا بەشیری رەحمەتی لە دڵمانان.

مەحمود خاکی خۆی ناوی مەحمود محەمەد کەریم و لە ساڵی ١٩٣٩ لە دایك بووەو لە ساڵی ١٩٩٠ ماڵئاوایی کردووە.

# ٢٦- دوکانی مەلا نوری عەزیزی ماستاو[٧٦]

**١٩٥٤**

لە نیسانی ساڵی ١٩٥٤ کە شەقامی گومرگە سوتاو دروست کراو حەمە رەشید ئاغای خاوەنی ئاشەکەی قاراغای مەلا محێدین کە ئامۆزای بوو لەسەر ئەم شەقامە نوێیە ریزێ دوکانی دروست کرد یەکێك لەو دوکانانە مەلا نوری کردیە کتێبخانەو پڕی کرد لە هەموو جۆرە کتێبێك بە تایبەتی کتێبە کوردیەکان هەر هەموو گۆڤارەکانی

حەمە نوری عەزیز

گەلاوێژو نزارو رۆژنامەکانی ئەوسای دەرچوو بوون وەك پێشکەوتن ، رۆژی کوردستان ، ژیان و ژین ، بە جزوبەندکراوی لای ئەم دەست دەکەوتن بەڵام بۆ فرۆشتن نەبوو تەنیا بۆ خوێندنەوە .

مەلا نوری تا بلێی ڕوو خۆش و دڵپا ك و دڵسۆزە بۆ كتێبی كوردی یارمەتی دەیان نووسەرو رۆژنامەنووسی داوە وەك سەرچاوەیەكی دەوڵەمەند بۆ لێكۆڵینەوەكانیان .

چەند جارێك بە هۆی باری سیاسی رۆژگارەوە كتێبخانەكەی پێچاوەتەوەو پاشان دایناوەتەوە . ئێستا كتێبخانەكەی وا لە گەڕەكی شۆڕش واتە (عەقاری).

# ٢٧- کتێبخانەی زێوەر

## ١٩٥٦ - ١٩٨٦

محەمەد عارف مەعروف

بۆ کردنەوەی هەموو کتێبخانەیەك ئەبێ مۆڵەتی یاسایی وەرگری بۆیە کاك محەمەد عارف[٧٧] داوایەکی پێشکەش کرد بە وەزارەتی ناوخۆ بۆ کردنەوەی کتێبخانەیەك لە ١٩٥٦/٧/٢٠ دا رەزامەندی وەزارەتی ناوبراوی وەرگرت ئیتر لەو رۆژەوە کتێبخانەی زێوەر لە شەقامی مەولەوی لە دوکانێکا تەنیشت دەرگای گەرماوی قشڵە کە ئێستا بازاڕی دەبۆکەیە پاشان لە ساڵی ١٩٦٠ گواستیەوە بۆ شوێنی کتێبخانەی ئازادی محەمەد رەسوڵ هاوار کە چەند دوکانێك خوار کتێبخانەی گەلاوێژەوە بوو .

لەو شوێنە مایەوەو هەمیشە پڕ بوو لە کتێب و ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو ساکە دەردەچوون ئەم کتێبخانەیە بەناوی شاعیری گەورە (زێوەرەوە ناونراوە) ئەگەرچی محەمەد عارف لەو بنەماڵەیەش نیە .ئەم کتێبخانەیەش وەك هەموو کتێبخانەکانی پێش خۆی هەڵسا بە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی کتێبی کوردی لەوانە :-

١- چۆن فێری زمانی عەرەبی ئەبیت/ عوسمان عارف ١٩٧١ سلێمانی چاپخانەی ڕاپەڕین (١٣٢) لاپەڕە .

٢- گۆمی شڵەقاو / محەرەم محەمەد ئەمین /١٩٥٧ بەغداد چاپخانەی ئەسعەد (٦٨) لاپەڕە .

٣- سروود بۆ قوتابیان / کۆکردنەوەی محەمەد عارف / ١٩٧١ سلێمانی چاپخانەی ڕاپەڕی ( ٤٠) لاپەڕە

٤- دیوانی زێوەر / عبدللا زێوەر / ١٩٥٨ بەغداد چاپخانەی مەعاریف (١٢٥) لاپەڕە .

٥- خەبات / عبدللا میدیا ١٩٥٨ بەغداد چاپخانەی لیوا (١٠٤) لاپەڕە

# ٢٨- کتێبخانەی ئازادی

## ١٩٥٨ - ١٩٦٠

ئەم کتێبخانەیە لە سەرەتاوە بەرامبەر میوانخانەی خەیام کە ئێستا (گازینۆی لۆڤەر) ە خوار یانەی سیروان لە سێیەم کۆڵانی بازاڕی زێوەرو پاشان گوێزرایەوە شەقامی مەولەوی خوار کتێبخانەی گەلاوێژ تەنیشت شێخەی نوقوڵی ئەوسا دوای ساڵی ١٩٦٠ ئەم کتێبخانەیە نەماو شوێنەکەی وەك وتمان کتێبخانەی زێوەر هاتە جێی ئەم

محەمەد رەسول هاوار

کتێبخانەیە لە لایەن مامۆستا (محەمەد رەسول هاوار) ەوە [(٧٨)] دامەزرا ئەمیش وەك هەموو کتێبخانەکانی تر پڕ بوو لە هەموو

جۆره کتێب و رۆژنامەو گۆڤار به رێك و پێکی رۆژانه بۆی ئـەهات له تەمەنی ئەم دوو ساڵەیدا چەندین کتێبی کوردی چاپ و بـڵاو کـردەوه ، مامۆستا محەمەد رەسوڵ هـاوار زێتر خزمەتکردنی رۆشنبیری‌یه له لاوه مەبەست بوو بۆیه زوربەی شاعیرو ئەدیبانی ئەو سەردەمه هاموشۆیان ئـەکردو لەوێ ئـەبینران لەوانـه وەك مامۆستایان مستەفا ساڵح کەریم خوالێخۆشبوو محەرەم محەمەد ئەمین بەهجەتی پارێزەرو مامۆستا نەجمەدین مەلا که ئەم له گەڵ محەمەد رەسوڵ هاوار بـه دوو قۆڵی لـه رۆژنامەی ژیـنی کـوردی ئەوسادا کاری رۆژنامەنوسیان ئـەکرد ئـەم بەناوی (لالۆ ئـەلی) دەینووسی . ئەو کتێبانەی چاپ و بڵاوی کردنەوه:-

١-دوانزه سوارەی مەریوان / پیرەمێرد چاپی دووەم ساڵی ١٩٥٩ سلێمانی چاپخانەی ژین (٢٦) لاپەڕه

٢- له پێناوی بەهێزکردنی یەکێتی نیشتمانیدا / چاپی دووەم ساڵی ١٩٥٩ بەغداد چاپخانەی رابیته (٧٦) لاپەڕه

٣- یادی بادینان / ١٩٥٩ / محەمەد رەسوڵ هاوار/ چاپخانەی ژین (١١٢) لاپەڕه.

له ساڵی ١٩٦٠ دا ئەم کتێبخانەیەش پێچرایەوەو نەما .

# ٢٩- نامەخانەی خەبات

## ١٩٥٨ - ١٩٦١

دامەزراندنی ئەم نامەخانەیە لە لایەن (پ . د . ك) دوە بوو لە شەقامی مەولەوی بەرامبەر کۆشکی تۆفیق قەزاز لە سەرەتاوە چەند کەسێك وەك ئەندامان و لایەنگرانی پارتی بەڕێوەیان ئەبرد لەوانە (دوکتۆر فارس رەحیم) و لەتیف ناوێك کە پاشان لە پارتی جیا بوونەوەو چوونە ریزی (پارتی کۆمۆنیستی عیراق) .

شێخ بەکر شێخ عەزیز

بەلاّم لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنیەوە ئەم کەسانە بەڕێوەیان ئەبرد (شێخ بەکر شێخ عەزیز باراوی) [٧٩] کە ئەندامێکی بزێو و چالاکی ئەوسای پارتی د کوردایەتی بوو دووەم بەکر جاهید (بەکری حاجی عەلی) وە

سێهەم سمکۆ فتحوڵڵا بوون بە سەرپەرشتیاری نامەخانەکەو سمکۆ فتحوڵڵا بەرپرسیاری ژمێریاری بوو بەکر چاهیدیش بەرێوەی ئەبرد هەموو رۆژێ بۆ دواکارتنی رۆژنامەی (خەبات) کە زمانحاڵی پ د ك بوو لە بەغداوە زوو ئەگەیشتە نامەخانەکەو دابەش ئەکرا ئەمە جگە لە هەموو رۆژنامەکانی تر و ئەو گۆڤارانەش کە دەردەچوون نامەخانەکە پڕ بوو لە کتێبی جۆراو جۆر .

(بە بۆنەی رۆژی رەشی ٦ ی ئایلوولی ١٩٦١ لە سلێمانی مانگرتنێکی گشتی سەرانسەری شاری گرتەوە و خەڵکی هەموو دوکان و بازاڕیان داخستبوو نامەخانەی خەباتیش یەکێك بوو لەو شوێنە گرنگانەی ئەوساکەمانی گرتبوو نەك بە داخستنی نامەخانەکە بگرە زوربەی زۆری ئەندامان و لایەنگرانی پارتی و لێپرسراوانی نامەخانەکەش بە نارەزایییەکەوە لەبەردەم نامەخانەکەدا وەستابوون لەوانە وەك بیرم بێ مامۆستای کۆچکردوو محەرەم محەمەد ئەمین بەکر چاهید سمکۆ فتحوڵڵا دەیان کەسی تر بۆیە رۆژی دوایی واتە ٧ ی ئەیلوولی ١٩٦١ پیاوانی ئەوسای رژێمی قاسم هاتن و هەڵیان کوتایە سەر نامەخانەکەو هەرچی تیادا بوو بەتاڵان بردیان و پاشان دەرگای نامەخانەکەشیان مۆر کرد)[٨٠].

ئەم نامەخانەیە هەمیشە جێی ئەهات لە هاتوچۆکەران خوێندەواران سەردیان ئەگرت کاتێ رۆژنامەی رۆژانەی خەبات ئەهات بۆ نامەخانەکە ئەم نامەخانەیەش وەك ئەرکێکی پیرۆزی رۆشنبیری زنجیرەیەك کتێبی کوردی چاپ و بلاو کردەوە لەوانەك:-

١-شۆرشی بارزان / هەمزە عبدوڵڵا ساڵی ١٩٥٩ مامۆستا محەرەم محەمەد ئەمین لە عەرەبییەوە وەریگێڕا بۆ کوردی و لە چاپخانەی ژین چاپکرا ٢- دڵ و گوڵ /مەدهۆش / ١٩٦٠ سلێمانی چاپخانەی کامەرانی (٦٤) لاپەڕە.

٣-ببوورە / کەماڵ رەئوف محەمەد / ١٩٦١ سلێمانی چاپخانەی کامەران ١٤٤ لاپەڕە.

١- سەرگوڵ / مەدهۆش / ١٩٦١ سلێمانی چاپخانەی کامەران ٧٤ لاپەڕە.

وەك وتمان لە ٧ ی ئایلوولی ١٩٦١ لە لایەن رژێمی قاسمەوە ئەم نامەخانەیەش مۆرکرا.

# ٢٠- كتێبخانەی بێکەس

## ١٩٥٨ - ١٩٦٠

لە شەقامی بێکەس بەرامبەر بازاڕی ڕاپەڕینی ئێستا شوێنی چێشتخانەی لیرە کە ئەوسا تەنیا دوکانێکی بچووك بوو لە لایەن (شێخ مستەفای گولانیەوە) دامەزراو هەر خۆشی بەرپرسیاری ئەو کتێبخانەیە بوو هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەوسای لابوو جگە لەوەی پڕ بوو لە کتێبی جۆراو جۆر هەمیشە ڕۆژنامەی ژین و خەبات و گۆڤارەکانی هیواو ڕۆژی نوێ و هەتاوی لا دەست ئەکەوت . لەگەڵ بچووکی جێگاکەیدا بە هەمیشە سیخناخ بوو لە ئەدیبان و ڕۆشنبیرانی ئەوکاتە ئەوانەی لێرە ئەبینران خوالێخۆشبوان عبداللا جەوهەر کامەران موکری عوسمان عوزێری محەرەم محەمەد ئەمین وەدەیان ڕۆشنبیری تر. کردنەوەی ئەم کتێبخانەیە زۆرتر بە مەبەستی هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگای کوردەواری و گۆشکردنی گیانی نەتەوایەتی و کوردایەتی بوو ئەمیش لە ساڵی ١٩٦٢ نەماو تەواو بوو.

# ٣١- نامەخانەی بیری نوێ

## ١٩٥٨ - ١٩٦١

ئەم نامەخانەیە لەگەڵ هاتنی شۆڕشی ١٤ ی تەمووزی ١٩٥٨ دا لە لایەن ئەندامان و لایەنگرانی پارتی کۆمۆنیستی عیراقەوە دامەزرا لە شەقامی کاوە بەرامبەر زەرەنگەرەکانی ئێستا لێپرسراو بەڕێوەبەری نەوزاد نوری سالح بوو هەڵسوڕێنەری دووەم ئەحمەد عەباس کەریم بوو .

هەموو کات جمەی ئەهات لە هەوادارانی پارتی کۆمۆنیست . ئەم کتێبخانەیە یا نامەخانەیە جۆرەها کتێبی سیاسی و فەلسەفی و مێژووی زانستی تیادا بوو وەك راس المال / کارل مارکس/ اصل العائلە، فریدریك انجلس وە هەڵبژاردەکانی لە نین و دەیان کتێبی تری لەم بابەتانە ئەوانەی هەمیشە سەردانی ئەوێیان ئەکرد لەوێ زۆر ئەبینران ئەدیبی ناسراو حسێن عارف و شاعیری خوالێخۆشبوو جەلالی میرزا کەریم و مامۆسا مستەفا سالح کەریم عومەری بابەشێخ و رەئوفی حاجی قادر و غەفوری میرزا کەریم و دەیان رۆشنبیرو هەوادارانی پارتی کۆمۆنیستی تر .رۆژنامەکانی ئەوسا هەموو رۆژێ زوو ئەگەیشتە نامەخانەکەو بڵاو ئەکرایەوە وەك رۆژنامەی رۆژانەی (طريق الشعب) رۆژنامەی (کوردی ئازادی) هەموو گۆڤارەکانی ئەوساش لێرە دەست دەکەوت یەکێك بوو لە باوەڕ پێکراوەکانی (گۆڤاری هیوا)[٨١] کە لە بەغداوە دەردەچوو ئەم لێرە بڵاوی دەکردەوە ئەم نامەخانەیەش هەر خۆیان پێچایانەوەو نەما لە ساڵی ١٩٦١ دا.

# ٣٢- کتێبخانەی شوێنەوار

## ١٩٦١

سالار مەجید ساڵح

ئەم کتێبخانەیە سەر بە شوێنەواری سلێمانی‌یەو لە ساڵی ١٩٦١ دا دامەزراوە لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی (شوێنەواری کۆنەوە) کە مەڵبەندی گشتی بەغدادە ئەم لقەی لە سلێمانی بۆ کرایەوە لەگەڕەکی شۆرش (عقاری) بەڕێوەبەر و لێپرساوی شوێنەوار و کێبخانەکە مامۆستا (ڕەفیق فتحوڵلا) بوو پاشان بەڕێزان عەبدو ڕەحمان حەکیم کرا بە لێپرساوی کتێبخانەکە لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ بەڕێز کاک سالار مەجید ساڵح کە کۆنترین فەرمانبەری ئەم کتێبخانەیە بوو تا ئەمڕۆ هەر بە چالاکی و دڵسۆزی‌یەوە بە پیر خوێندەوارانەوە دەچێ ووتی : (یەکەم

کتێب قورئانی پیرۆز و تەفسیری (جەلالیین و دائرە المعارف) لە ژمارە یەکەوە تا ۲۷ بۆ ئەم کتێبخانەیە هات .

ئەم کتێبخانەیە لە تەنیا ژوورێکی شوێنەواردا بوو کە بریتی بوو لە ٦ دۆلابی دار لەو ژوورەدا کە ٤x٣ بوو مێزوو کورسیەکی تیادا بوو تا ساڵی ۱۹۷۱ ئیتر کتێبخانەکە گەورە کراو هەندێ دۆلابی ئاسنی تریان لە بەغدادەوە بۆ ناردین لەگەڵ چەندین کتێبی نایاب و جزو بەندکراو پاشان خانوویەکیان بۆ بەکرێ گرت هەر لە هەمان گەڕەکی شۆڕش . ئاگاداری و بانگەوازیش بڵاوکرایەوە بۆ خوێندکارانی ئەوسای زانکۆی سلێمانی تا ڕوو بکەنە کتێبخانەی شوێنەوار بۆ زیاتر فراوانکردنی ئاستی زانستیان ئیتر پەیتا پەیتاو پۆل پۆل خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی ڕوویان تێ ئەکردوو ڕۆژانە ٥٠ تا ٧٠ خوێنەری هەبوو) [٨٢] .

ئەم کتێبخانەیەش وەك هەموو کتێبخانەیەکی میری کۆمەڵێ فەرمانبەرو کارمەندی دڵسۆزو چالاکی خۆی هەبووە لەوانە مامۆستا عبداللە تۆفیق حەمە ڕەشیدو عەبدورەحمان حەکیم و مامۆستا کەمال رەئوف محەمەدو کۆچ کردوو کاکەی فەللاح و خوشکە نەزیرە کەریم کاك سالار مەجید سالح [٨٣] .

ئەم کتێبخانەیە تا ساڵی ۱۹۷۹ لە گەڕەکی شۆرش مایەوەو پاشان گوێزرایەوە بۆ ئەم بینا گەورەیەی ئێستا کە سەر بە وەزارەتی ڕۆشنبیرییەو وەزارەتیش هەر لێرەیە بەڵام کتێبخانەکە هەر لە نهۆمی خوارەیەوەو بریتییە لە هۆڵێکی گەورە بۆ خوێندنەوەو هۆڵێکی گەورەتر لەم بۆ گەنجینەی کتێبخانەکە کە ئەویش زیاتر لە

(٤٤ دۆلابــی ئاســن) و (٦٥ دۆلابــی گــەورەی) (داری ســاجی تیادایەو) کــە نزیکـەی (١٦٠٠٠) کتێـبی هەمــەجۆرو نایـابی بـە شێوەی عشری تیا تەصنیف کراوە بۆ نموونە (المعاریف العامە) لە سفرەوە تا ٩٩ دووهەم (الفلسفە علم النفس) لە ٩٩ تا ١٩٩ هتد .....

ئێستا ئەم کتێبخانەیەی شـوێنەوار سـەر بـە بەڕێوەبەرایـەتی شوێنەواری گشتییە لە وەزارەتـی رۆشـنبیری حکومـەتی هـەرێمی کوردستان - لە سلێمانی - .

# ٣٣- کتێبخانەی خانزاد

**١٩٦٧ - ١٩٧١**

ئەخۆڵ

**خاوەن و دامەزرێنەری کتێبخانەی خانزاد خوالێخۆشبوو (ئەخۆڵی) شاعیرە[٨٤].**

ئەم کتێبخانەیە کەوتبووە شەقامی مەولەوی لە یەکێك لە دوکانەکانی ریزی سەرجادەی پێشەوەی بازاڕی دەبۆکەی ئێستا.

ئەخۆلی شاعیر لەبەر کەم دەرامەتی و بژێوی ژیان هەر لە هەمان کتێبخانەشدا نووسینگەی تایبەتی دانابوو بۆ نووسینەوەی سکالاًنامە بۆ خەلکی. ئەم پیاوە هەر لە سەرەتای ژیانیەوە لە چاپخانەی شارەوانی لای (پیرەمێرد) وەك پیت ریکخەرێك کاری لە رۆژنامەی ژیاندا ئەکرد تا ١٩٣٤/٣/٣١ پاشان لە دادگای سلێمانیدا بوو بە کاتبی دادگا تا سالّی ١٩٧٠.

ئەم کتێبخانەیە وەك کتێبخانەکانی تر نەیتوانی ئەو ئەرکە پیرۆزە بەجێ بێنێ لە چاپکردن و بلاّوکردنەوەی کتێبی کوردیدا و لە سالّی ١٩٧١ دا پێچرایەوەونەما.

# ٣٤- کتێبخانەی پێشەوا ئیمامی غەزالی

## ١٩٦٧ -١٩٨٧

حاجی حەسەن فەتاح

لە شەقامی شێخان بەرەو ژوور بۆ دادگاکان لە لای راست دوکانێکی بچووك پیاوێکی لاوازی ڕوو خۆش کەمێکیش لە قسەکردنا زمانی ئەیگرت ناوی (حاجی حەسەن بوو)[٨٥] دوکانەکەی پڕ کردبوو لە کتێبی ئاینی و چیرۆکی فۆلکلۆری وەك رۆستەم و زۆراب و ئەمیر ئەرسەلان یوسف و زلێخاو ئەو بابەتانە لەگەڵ کۆمەڵێك لە قورئانی پیرۆز کە هەریەکەو لە شوێنێك بە چاپێکی جوان چاپکرابوون لەسەری سەرەوەی ئەو رەفانەی کردبوونی بۆ کتێبەکان دایناببوون.

له سەرەتاوە هیچ رۆژنامەو گۆڤارێکی لانەبوو .

ئـەم کتێبخانەیـە پاشـان گواسـتیەوە بـۆ سـابوونکەران لـەوێ مایـەوە تـا سـاڵی ١٩٨٧ لـەم بیسـت سـاڵەی تەمـەنی ئـەم کتێبخانەیەش ئەم کتێبانەی بەچاپ گەیاندوو بڵاوی کردنەوە:-

١-گوڵاڵـەی بـەهاری جوانیـم/ حەمەسـەعید مـەعروف / ١٩٧٠ سلێمانی چاپخانەی ژین (٤٤) لاپەڕە.

٢-سـۆزی دڵـداری / کاکـەی رێبـوار / ١٩٦٧ سـلێمانی چاپخانەی ژین (٢٤) لاپەڕە.

٣-مەکری ژنان / عەلی کەمال باپیر ئاغای شاعیر / ١٩٧٠ سلێمانی چاپخانەی ژین ٦٦ لاپەڕە.

# ٣٥- کتێبخانەی پیرەمێرد

## ١٩٦٧- ١٩٧٤

ئەم کتێبخانەیە کەمێك خوار بەردەرکی سەرا لە شەقامی کاوە لە یەکێك لە دوکانەکانی بازاڕی عەسری بەدیوی کاوەدا کە مامۆستای شاعیر خوالێخۆشبوو کاکەی فەللاح [٨٦] دایمەزراند لە ساڵی ١٩٦٧ دا بە ناوی (کتبخانەی پیرەمێرد).

ئەگەرچی کەمتر کتێبی تیادا بوو بەلاّم وەك بنکەیەکی وتووێژی ئەدەبی کاکەی فەللاح ئەم کتێبخانەیەی دامەزراندبوو زۆری کات شاعیران و ئەدیبان و ڕۆشنبیران لەلای دائەنیشتن بە تایبەتی پرۆفیسۆر د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ و ع.ع شەونم و عەلی باپیر ئاغاو هەرکاتێك کۆچکردوو فەرەیدوون عەلی ئەمین سەردانی سلێمانی بکردایە لە بەغداوە لای ئەم ئەبینرا هەروەها جەمال شارباژێڕی و شێرکۆ بێکەس و هەر کاتێکیش مامۆستا حسێن عارف سەردانی سلێمانی بکردایە دیدەنی کتێبخانەکەی ئەکرد بەلاّم ئەم دوانە دوای دەرچوونی پەیامی ڕوانگە ئیتر زویر بوون و هاموشۆیان بڕی ..!!

مامۆستا کاکەی فەللاح دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر توانی چاپخانەیەك دابین بکا بۆ کتێب چاپکردن ، بەلاّم کام چاپخانە ؟ کۆن و پەرپووت و لە کەڵك کەوتوو هی دەورووبەری سیەکان بوو بۆیە بۆی بووبووە مایەی ماندووبوونێکی یەکجار زۆر و سەر ئێشەیەکی تەواوی بۆ دروست کردبوو . ئەم چاپخانەیە هەر لە

کاکەی فەللاح

چاپخانەی پیرەمێردی نەمری ئەکرد ئەبوایە خۆی هەموو پیتەکانی کۆکردبایەوەو پاشان ڕێکیان بخا دیارە کە ئەمەش بە ڕاستی شەکەتی کردبوو بۆیە زۆربەی ئەو کتێبانەی لێرە چاپ دەکران پڕ بوو لە هەڵەو بە شێوەیکی ناشیرین چاپ دەکرا هەر ئەم هۆیەش

بوو دوایی خۆشی بۆ چاپکردنی کتێبەکان ناچار رووی کردەوە بەغدادو لەوێ چاپی دەکردن ئیتر ئەم چاپخانەیە تەرخان کرا بۆ پڕوپاگەندەی بازرگانی بۆ پڕوپاگەندەی شیرینی و ساردەمەنیەکان کاری دەکرد .

بێگومان بە تەنیا کاکەی فەللاح نەیئەتوانی سەرمایەیەکی وا دابین بکا بۆیە لەگەڵ (یوسفی عەبەکە) رێکەوتن و چاپخانەیەکیان هێناو لە بەغدادەوە لە شەقامی پیرەمێرد لە کۆڵانێك کە تا ئێستاش ماوە دایاننا .هەر زوو یوسفی عەبەکە وازی هێناو کاکەی فەللاح تەنیا مایەوە ئیتر لە رێی ئەم چاپخانەیەوە کەوتە خزمەتکردن بە وشەی کوردی.

کاکەی فەللاح یەکێك بوو لە نیشتمان پەروەرەکانی سالانی تێکۆشانی سەردەمی پاشایەتی و ناو و ناوبانگێکی باشی هەبوو لەناو کۆمەلانی خەلکی ئەوسای خەباتا.

پاش ئەوەی چاپخانەکەی دانا کەوتە مۆلەت وەرگرتن بۆ وەرگرتنەوەی ئیمتیازی رۆژنامەی ژین ئەوەبوو رەزامەندی وەرگرت و رۆژنامەی ژینی دەرکردەوە و هەموو هەفتەیەك جارێ دەردەچوو لەپاڵ کتێبخانەو چاپخانەو رۆژنامەی ژین دا ئەم زنجیرە کتێبەی ... بلاو کردەوە :-

... وارینەکانی خەیام / شێخ سەلام / چاپی دووهەم و ... سلێمانی چاپخانەی کامەران (٩٥) لاپەڕە.

٢- سروود بۆ قوتابیان / کۆکردنەوەو ئامادەکردنی کاکەی فەللاح / ١٩٦٧ بەغداد چاپخانەی (سلمان الأعظمي) (٣٨) لاپەرە.

٣- لەگەڵ شەپۆلەکان / کاکەی فەللاح / ١٩٦٧ بەغداد چاپخانەی سلمان الاعظمی (٥٠) لاپەڕە.

٤-چرۆ / کاکەی فەللاح / ١٩٦٦ بەغداد چاپخانەی (سلمان الأعظمي) (٤٨) لاپەڕە.

٥-شێری ساختە / کاکەی فەللاح ١٩٦٧ سلێمانی چاپخانەی کامەران (٣٢) لاپەڕە.

٦-مەم و زین / پیرەمێرد / چاپی دووەم / ١٩٦٨ سلێمانی چاپخانەی ژین (٣١) لاپەڕە.

٧-لە پەندەکانی پیرەمێرد / کۆکردنەوەی کاکەی فەللاح / بەرگی یەکەم چاپی یەکەم ١٩٦٩ بەغداد چاپخانەی سەلمان الأعظمي (١٦٨) لاپەڕە.

٨- لە پەندەکانی پیرەمێرد / کۆکردنەوەی کاکەی فەللاح / بەرگی دووهەم چاپی یەکەم ١٩٦٩ بەغداد چاپخانەی سەلمان الأعظمي .

٩- چوارینەکانی نەغەعی / شێخ سەلام / ١٩٦٩ بەغداد چاپخانەی سلمان الأعظمي ٠٤٤) لاپەڕە.

١٠- لە پەندەکانی پیرەمێرد / کۆکردنەوەی کاکەی فەللاح / بەرگی سێهەم چاپی یەکەم ١٩٧٢ سلێمانی چاپخانەی کاکەی فەللاح (١٦٠) لاپەڕە.

١١- شیعرەکانی شێخ نوری‌و شێخ مستەفا / کاکەی فەللاح / ١٩٧٢ سلێمانی چاپخانەی کاکەی فەللاح (٤٦) لاپەڕە .

١٢- شعری کۆن و تازە / سالّح هەژار / ١٩٧٣ سلێمانی چاپخانەی کاکەی فەللاح (٤٨) لاپەڕە.

١٣- جگەر گۆشەکان / کاکەی فەللاح / ١٩٧٨ بەغداد چاپخانەی دار الحریە / (١٤٢) لاپەڕە.

١٤- ئۆدیپی پاشا / و/ کاکەی فەللاح / ١٩٧٨ چاپخانەی نیە (١٣٢) لاپەڕە.

١٥- کەمانچەژەن / و / پیرەمێرد / ١٩٧٩ / چاپی دووەم بەغداد چاپخانەی حوادپ (١٦٠) لاپەڕە.

١٦- کاروانی شیعری نوێ / کاکەی فەللاح/ بەرگی یەکەم چاپی یەکەم ١٩٧٩ بەغداد چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد (٢٦٢) لاپەڕە).

١٧- کاروانی شیعری نوێ / کاکەی فەللاح / بەرگی دووەم چاپی یەکەم ١٩٧٩ بەغداد چاپخانەی حیسام (٢٦٠) لاپەڕە.

١٦- جگەر گۆشەکان / کاکەی فەللاح / چاپی دووهەم / ١٩٨٠ سلێمانی چاپخانەی کاکەی فەللاح (١٣٩) لاپەڕە .

١٩- لە پەندەکانی پیرەمێرد / کۆکردنەوەی کاکەی فەللاح / بەرگی چوارەم چاپی یەکەم ١٩٨٠ بەغداد چاپخانەی حوادث (٢٣٥) لاپەڕە.

٢٠- کاکەی فەللاح / دیوانی شیعرەکانی کاکەی فەللاح / ١٩٨٠ بەغداد چاپخانەی حوادث (٣٣٠) لاپەڕە.

٢١- چۆلەکە بچکۆلەکە / و/ کاکەی فەللاح / ١٩٨١ سلێمانی چاپخانەی کاکەی فەللاح (١٩) لاپەڕە.

٢٢- ئەنجوومەنی ئەدیبان / ئەمین فەیزی / چاپی دووهەم /١٩٨٢ سلێمانی چاپخانەی کاکەی فەللاح (١٦٣) لاپەڕە.

٢٣- چۆلەکە پاساری /کاکەی فەللاح/ ١٩٨٣ سلێمانی چاپخانەی کاکەی فەللاح (٥٤) لاپەڕە.

٢٤- ماڵ و قوتابخانە / کاکەی فەللاح / ١٩٨٤ سلێمانی چاپخانەی کاکەی فەللاح (٢٦) لاپەڕە.

# ٣٦- کتێب فرۆش مارف ناسراو

## ١٩٦٧ - ١٩٧٢

مارف ناسراو

لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٧ دوە •مارف ناسراو) [٨٧] کتێبەکانی کتێبخانەکەی ماڵەوەی خۆی هێناو لە شەقامی مەولەوی بەرامبەر بازاڕی عەسری لەبەردەم دیواری بەریدی ئەوسای سلێمانی داینا بۆ فرۆشتن کتێبەکان لە چەندین کتێبی ئەدیبی و مێژوویی دیوانی شاعیران و کۆمەڵێک گۆڤاری کۆنی جزو بەندکراوی وەك گەلاوێژو هیواو رۆژی نویٚ و شەفەق هتد.... دەیان کتێبی عەرەبی و گۆڤاری تری عەرەبی .

مارف ناسراویش وەك خوالێخۆشبوو مەحمود خاكیو جەمال محەمەد ئەمین و دواتریش شێخ ئەنوەر هەموو بە ریزەو بە شێوەیەكی رێك و پێك لەسەر تەختەو بە پاڵ دیوارەكەوە كتێبەكانیان دانابوو هەر كتێبێكی نوێش بڵاو بكرایەتەوە خێرا ئەچوو لە كتێبخانەی گەلاوێژ یا سلێمانی وەری ئەگرت .

زۆریش لە نووسەران و شاعیران كتێبە چاپكراوەكانی خۆیان بۆ ئەبرد تا بیان فرۆشێ .

مارف ناسراویش وەك كۆچكردو و مەحمود خاكی ئێواران كتێبەكانی ئەكردنە ناو عەرەبانەیەكی بۆڵ برینەوەو لەو بەر لەناو بازاڕی عەسرییە لە یەكێك لە دوكانێكەوە بە زنجیر ئەیبەستەوە .

زۆرجار كەسانی ناسیاوو ئاشنای هەبوو دەستكورت و خوێندكار بوو توانای كڕینی كتێبیان نەبوو ، ئەم ئەو كتێبەی ئەدانێ و دوای خوێندنەوەی وەری ئەگرتنەوە بەم شێوەیە تا ساڵی ١٩٧٢ ئیتر وازی لە كتێب فرۆشتن هێنا .

ئەوانەی هاتوچۆ و لەبەردەم كتێبەكانیدا ئەوەستان خوالێخۆشبووان دیلانی شاعیر بورهان قانیع و وریا قانیع و جەمال بەختیاری هونەرمەند جەمال شارباژێڕی و مامۆستا عومەر مەعروف بەرزنجی و سەباح غالب و ئەحمەد سالار و دكتۆران كەمال میراودەلی و رەفیق سابیر جەزا عەلی ئەمین رشەهید دلشاد مەریوانی و عبدالرزاق پشدەری و حەمە سەعید حەسەن و كاوەی رەئوف زوهدی لەوێ ئەبینران .

# ٣٧- پڕۆژەی خوێندەواری کورد ١٩٢٧

## یا نووسراوخانەی گوڵزاری کوردستان ١٩٣١ که دواتر ناونرا کتێبخانەی پڕشنگ ١٩٦٨ - ١٩٧١

که ئەڵێین پڕۆژەی خوێندەواری کورد مامۆستای شەهید شاکیر فەتاح مان دێتەوە یاد ، هەر لە سەرتای لاویەوە کاتێ تەمەنی ١٦ ساڵ بووە دەستی کردووە بە کۆکردنەوەی هەموو جۆرە کتێب و گۆڤارو رۆژنامە کوردیەکانی ئەوساو لە پاڵیانا بە دەیان کتێبی عەرەبی و تورکی و فارسی ، جگە لە چەندین کۆمەڵە کتێب بە زمانەکانی تر لە ساڵانی ١٩٢٧ تا ١٩٣١ کتێبخانەیەکی جوانی رازاوەی لە ماڵەوە دروست کردبوو ناوی نابوو (نووسراوخانەی گوڵزاری کوردستان) ئەوەتا خۆی لە یادنامەکەیدا کە بە ناوی (ئاوێنەی ژینم) دا ئامادەی کردووە دەڵێ :(ئەم پڕۆژەیە لە ساڵی ١٩٦٧ دا بڵاو کرایەوە ، بەڵام لە راستیدا سەرەتای دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢٧ و لە ساڵی ١٩٣١ دا نووسراوخانەیەکی تایبەتیم لە ماڵەکەی خۆماندا دامەزراند ناوم نا (نووسراوخانەی گوڵزاری کوردستان)[٨٨] ئەو هەموو کتێب و گۆڤارو رۆژنامانەی کۆی کردبوونەوە لەم کتێبخانەیەدا بوون ، ئەمە جگە لە چەندین دەستنووس و کەشکۆڵ و بەڵگەنامەی مێژوویی گرنگ .

بەڵێ مامۆستای شەهید شاكیر فەتاح زۆر بایەخی دابوو بە دروست كردن و دامەزراندنی كتێبخانە ، تەنانەت لەم ساڵانەی دوایی و كۆتایی شەستەكاندا لە ساڵی ١٩٦٨ لە شەقامی سالم لە یەكێك لە دوكانەكانی ژێر میوانخانەی (ئاشتی) بەرامبەر كارگەی جگەرەی ئێستا لەگەڵ مامۆستا عومەر فەتاح پێكەوە كتێبخانەی (پرشنگ) یان دامەزراند بەڵام هەرزوو ساڵێكی نەبرد كە مامۆستا شاكیر فەتاح گواستیەوە بۆ ماڵی خۆیان و لە گۆشەیەكدا

سەر لە نوێ کتێبخانەکەی کردەوە ، ئەگەر چی مەبەستی شاکیر فەتاح لە کردنەوەی کتێبخانەدا بازرگانی نەبوو ، بگرە زێتر خزمەتکردنی کۆمەڵی کوردەواری بوو تا چاکترو باشتر وریا ببنەوەو ئاستی رۆشنبیری لە پلەیەکی پێشکەوتووتر دا بێت بۆیە هاتەوە بۆ جێ بەجێکردن و کارکردنی پرۆژەکەی بە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبانەی کە بەرهەمی نووسینی خۆی بوون هەروەها ئەو نووسراوانەی کە لە زمانە جیا جیاکانەوە کردبوونیە کوردی بە شێوەیەکی رێك و پێك و بە زنجیرە رێکی خستبوون کە ئەویش بریتی بوو لە (١٦٥) نووسراو و لە (٢٠) زنجیرەی جیاواز هێندە نووسین و بەرهەم و کتێب و وتارەکانی زۆرن ئەگەر بێت و هەر ناونیشانی ناوەکانیان بنووسین بە چەند کتێبێکی گەورە تەواو نابن .

ئەم پیاوە دڵسۆزە کورد پەروەرە هەموو ژیانی لە پێناو وشیارکردنەوەی کۆمەڵ دابوو تا بڵێی راستگۆ و هێمن و هەست ناسك و پێشکەوتووخوازو گیانبەخش بوو .

کاتێکیش کرا بە راستگری (ئەنجوومەنی یاسا دانانی ناوچەی کوردستان) تەنیا مەبەستی زیاتر خزمەتکردن بوو لەم رێگایەوە بە گەل و وڵاتەکەی . کە لە مەبەستی چەپەڵ و گڵاوی دوژمنان گەیشت کە بۆ ئەم و زاناو ئەدیبی خوالێخۆشبوو عەلائەدین سوجادیان دەستنیشان کردووە بۆ ئەم کارە چونکە ئەمان ناوو ناوبانگێکی چاك و جێی خۆشیان کردبۆوە لە دڵی هەمواندا ، بۆیە چیتر لە دوای ١٥/١١/١٩٨٠ وە وازی هێناو هاتەوە سەر

چاپکردنی نووسراوەکانی پرۆژەی خوێندەواری کـورد کـە ئامـادەی کردبوون زۆر لە جاران بە گورتر دەستی پێ کردەوە . تا لە بەهاری ساڵی ١٩٨٨ دا لە لایەن (ئەنجوومەنی باڵای یاسا دانانی ناوچـەی کوردستانەوە) لـە هـەولێر داوای لێکـرا راپۆرتێـك ئامـادە بکـات سەبارەت بـە بـاری ئەوسـای کوردسـتان لـەو کۆبونـەوە گەورەیـەدا بیخوێنێتەوە . شەهیدی نەمر شاکیر فەتاح هەر لەسـەرەتای ژیـانی لاوییـەوە بەڵێنی راسـتگۆیی و دڵسـۆزی بـە کوردسـتان‌و نەتـەوە نەخوێندەوارەو دواکەوتووەکەی دا بو (هەتا بمێنم سامان و گیانم لە پێناو کامەرانی و پێشکەوتن و سەربەرزی "کورد" دا بەخت بکـەم ئیتر لەوساوە هاتمە کۆڕی "نیشتمان پـەروەری" و گـەل پەروەریـەوە ئەوەندەی هۆش بڕی کردبێ‌و لە توانـامدا بووبـێ بـە پێـی کـات و جێگاو مرۆڤ لە کۆشش کردن دوا نەکەوتووم) (٨٩).

بەڵێ هەر لـە سـاڵی ١٩٤٠ دا کـە بـوو بـە کـارگێری لادێـی خورماڵ کە بەشێك بـوو لـە ناوچـەی هەڵەبجـە ، زۆری هـەوڵدا بـۆ کردنەوەی خوێندنگایەك ، بەڵام فـەرمانڕەوایانی ئـەو کاتـە ڕێیـان نەداو بۆیان نەکردەوە ، ناچـار خـۆی لەگـەڵ خـەڵکی ناوچەکـە بـە تایبەت ٠شێخ حسام الدین) کە لە خانەقاکەی خۆی ژوورێکـی بـۆ تەرخان کرد تا بکرێتە خوێندنگاو بە شەو خەڵکی ناوچەکە تیـایدا بخوێنن ، ئەگەر چی هەموو پیاو و خاوەن ژن و منـاڵ بـوون ، بـەڵام شاکیر فەتاح بە مەبەستی نەهێشتنی نەخوێندەواری بە هەوڵی خۆی و دوو فەرمانبەری تر کەوتنە دەرس وتنـەوە بـە خوێندکارەکـان لـە هەمان کاتیشا رۆژنامەیەکی دەسنووسی بەناوی (خورماڵ) ەوە بـۆ

دەرئەکردن هەموو هەفتەیەك دانەیەك هەڵدەواسرا کە لە (٣/٦/١٩٤٠ تا ٢٤/٩/١٩٤٠ (٢٤) ژمارەی لێ دەرکرد)[٩٠] کاتێکیش بوو بە کارگێری لادێی قادر کەرەم) دیسانەوە بە هەمان شێوە کەوتە دەرکردنی رۆژنامەی (باسەرە) کە ئەویش هەر خۆی دەینووسیەوەو هەفتەی جارێك دەری دەرکردو بە دیوارا هەڵیدەواسی ئەمیش لە (٢٥/٢/١٩٤٢ تا ٢٣/١١/١٩٤٢ (٢٤) ژمارەی لێ دەرچوو)[٩١] کە بوو بە قایمقامی ناحیەی چەمچەماڵ دیسانەوە رۆژنامەیەکی دەسنووسی هەفتەی جارێك بۆ دەردەکردن و هەڵی دەواسی کە ئەویشی ناونابوو (چەمچەماڵ) لە(١/٧/١٩٤٦ دوە تا ١٣/٨/١٩٤٦ حەوت ژمارەی دەرکرد)[٩٢].

لە ساڵی ١٩٥٠- کە بوو بە سەرۆکی شارەوانی ئاکرێ ئەوێش بە هەمان شێوە بەناوی (ئاکرێ) رۆژنامەیەکی دەستنوسی دەرکرد هەفتەی جارێك لە (١٥/٧/١٩٥٠ تا ١٥/٩/١٩٥٠ (١٠) ژمارەی دەرچوو)[٩٣] ئەمە جگە لە زۆر دڵسۆزی تر بۆ ئەو ناوچانە بە کردنەوەی خوێندنگاو باخچەو شەقام و مزگەوت .

بەڵێ ئەو کاتەش کە داوای لێکرابوو ئەو راپۆرتە بنووسێ و بیخوێنێتەوە لە خوێندنەوەیدا گەیشتبووە سەر ئەم رستەیە (بۆ ناچن لەگەل سەرانی شۆرشی کوردا وتوویژ بکەن) بە جارێك وەك بۆمبایەك تەقیەوەو هۆڵەکەی شڵەژاند لە هەموو لایەکەوە کاسەلیسان و خائینان بەچاوو بە دەست ئیشارەتیان بۆ ئەکرد کە پەشیمان بێتەوە ، تەنانەت لە پشووی نێوان دانیشتنەکەدا لەولاوە

یەکێك لە ناحەزان پێی وتبوو (کە گەڕاینەوە هۆڵەکە داوای لێبوردن بکە !) لە وەڵامدا وتبووی "لێبووردن لەچی!" بۆ من شتێکی خراپم وتووە لەوەی کە با ئیتر کەم خەڵکانی وڵاتەکەم بکوژرێ و لەگەڵ سەرانی شۆڕشدا رێك بکەون و دانیشن بۆ وتووێژ ؟) لە دانیشتنەوەی دوهەمدا هەموویان چاوەڕوانی پەشیمان بوونەوەی شەهیدی نەمر مامۆستا شاکر فەتاح یان ئەکرد ، بەڵام ئەو هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە خۆی بۆ خزمەتی گەل و وڵاتەکەی دانابوو بۆیە نەك هەر پاشگەز نەبووەوە بگرە زۆر جوامێرانە سوور بوو لەسەر ئەو هەڵوێستە ئازایانەی خۆی . (تا لە هەولێر گەڕایەوە سلێمانی لە شەوی ٢٠-٢١/٣/١٩٨٨ چوون لەماڵەوە بردیان و تا ئەمڕۆ بێ سەرو شوێنە)[٩٤].

ئەمە لە کاتێکدا کە رۆژانە یادی شەهیدان دەکرێتەوە بگرە هی وایان هەیە کتێبی گەورە گەورەی لەسەر ئەنووسرێ ، بەڵام ئەو پیاوە دڵسۆزە گیان بەخشە نەك پەیکەرێك بگرە یادیشی ناکرێتەوەو خەریکە ناوی لەبیر ئەچێتەوە کە جێی داخە ئەو پڕۆژەیەی وتمان تا ئەمڕۆ (٥١) کتێبی نووسینی خۆی لێ بە چاپ گەیاندووەو بڵاو کردۆتەوە (١٢٠) نووسراوی وەرگێڕاو لەوانە (٨٣) ی لێ چاپکردوون بڵاوی کردۆتەوە .

شاکر فەتاح لە ژیانی فەرمانبەریدا زۆر پلەو پایەی بەرزی پێدراوە وەك بەڕێوەبەری ناحیەو قایمقام و سەرۆکی شارەوانی جێگری پارێزگارو راستگری ئەنجوومەنی باڵای یاسادانانی ناوچەی کوردستان ، هەروەها جێگری سەرۆکی نووسەرانی کورد لە ساڵی

١٩٧٠ - ١٩٧١ لەو هەموو کارو فەرمانانەی پێی درابوون زۆر بە دڵسۆزی و چست و چالاکانە بەڕێوەی بردوون و لە خزمەتی هاونیشتماندا بووە .

شاکیر فەتاح لە ساڵی ١٩١٤ لە گەڕەکی دەرگەزێن لە شاری سلێمانی لە دایك بووەو هەر لەوێ خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووەو پاشان لە بەغدا ناوەندی و دوا ناوەندی ساڵی ١٩٣٦ لە زانستگای ماف لە لوبنان دەرچووەو هەر لەو ساڵەوە بۆتە فەرمانبەرو تا ساڵی ١٩٦٤ کە ئیتر خانەنشین کراوەو لە ٢٠-١٩٨٨/٣/٢١ دا وون کراو وەك ئەڵێن بە نهێنی دەستڕێژ کراوە.

# ٣٨- كتێبخانەی مەولەوی

## ١٩٨٧-١٩٦٨

ئەم کتێبخانەیە لەلایەن (جەمال محەمەد ئەمین)[٩٥] و مەحمود خاکی‌یەوە لە ساڵی ١٩٦٨ وە دامەزراوە کە پێش تر لەسەر شۆستەی شەقامەکان کتێبیان ئەفرۆشت وەك لە باسی مەحمود خاکی‌و مارف ناسراودا ئاماژەمان بۆ کردبوو. جا ئیتر ئەمان رێك کەوتن لەسەر ئەوەی کتێبخانەیەك بکەنەوە، دوای وەرگرتنی مۆڵەتی یاسایی رەزامەندی کردنەوە یان لە ساڵی ١٩٦٨ وە

جەمال محەمەد ئەمین

وەرگرت‌و لەناو بازاڕی عەسری نیوە دوکانێکیان بۆ بە کرێ گرت بە پێنج شەش ریزتاق‌و رەفەو تەختە دوکانەکەیان رێك خست

کتێبەکانیان بۆ گواستەوە، کتێبەکان هەرچی کتێبێکی کوردی ئەوسا بوو هەر هەمووی لەوێ دەست دەکەوت گۆڤاریش ناو بە ناو کۆنەکانیان لا دەست دەکەوت، بەڵام رۆژنامەیان لانەبوو نە بۆ فرۆشتنی نە بۆ خوێندنەوە لەگەڵ کتێبەکانیشدا بە دەیان وێنەی رەنگاو رەنگی گەورەو پچوکی سروشت چەندین تابلۆی قەشەنگیان لابوو بۆ فرۆشتن هەر زوو مەحمود خاکی وازی هێنا بەڵام ئەمجارە نەچوە شەقام‌وشۆستەکان بەڵکو لە گازینۆی شەعب ژوورێکی پچوکی گرت‌و سیخناخی کرد لە کتێب‌و گۆڤارە کۆنە بەڵام جەمال محەمەد ئەمین لە هەڵسوراندنی کتێبخانەی مەولەی دا هەر بەردەوام بوو، کتێبخانەکەی ئەم زۆرتر بۆ بژێوی ژیان دانرا بوو تا ساڵی ١٩٨٧ لەو ماوەیەدا توانی دوو کتێب بە چاپ بگەیەنێ:

١- هەمیشە بەهار/ مەدهۆش/ ١٩٨٤

٢- لەیل‌و مەجنون /و/ مەلا فەرەج ساڵح/ شەکیبی شاعیر/ ١٩٦٩ سلێمانی چ راپەڕین ١٣٨ لاپەڕە

# ٣٩- کتێبخانەی زانکۆی سلێمانی

## ١٩٦٨-١٩٨١

لەگەڵ کردنەوەی زانکۆی سلێمانیدا ساڵی ١٩٦٨ هەر لەو بینا گەورانەی بۆ بەشەکانی کۆلیژەکان دروستکرا بوو شوێنێکی گەورەش بۆ کتێبخانەی زانکۆ تەرخانکرابوو، کە پڕبوو لە جۆرەها کتێب واتە بە هەزران کتێبو گۆڤارو رۆژنامەی بۆ دابین کرابوو لە هەموو بوارەکانی زانست، ئەدەب، مێژوو ..هتد. کە خۆی بۆ خۆی سەرچاوەیەکی گرانبەهای هەرە گرنگی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی بابەتەکان بوو بۆ خوێندکارو ئەدیب و رۆشنبیرەکان بە گشتی لە بوارەکانی داهێنانا.. ئەم کتێبخانەیە بەڕێز خاتوو (نەزیرە کەریم) لێپرسراوی بوو ئەگەر چی رژێمی بەغدا لە ساڵی ١٩٧٦ وە کەوتە داپڵۆسینو سەر کوتکردنی خەڵکی شاری سلێمانیو زۆریش داخ لە دڵبووو بۆیە هەمیشە لە تۆقاندنو راونانو گرتنو لە سێدارەدانی دەیان لاوو خوێندکاری زانکۆی سلێمانی نەوەستا تا کار گەیشتە هەڵوەشاندنەوەی زانکۆو لە ساڵی ١٩٨١ بە تەواوی گواستیوە شاری هەولێرو ناوی نا زانکۆی (صلاح الدین) کتێبخانە دەوڵەمەندەکەشی لەگەڵ زانکۆدا پێچرایەوە، بەڵێ دوای راپەڕینی مەزنی جەماوەری کوردستان هەر بە ویستو خوازی خەڵکی جەماوەری سلێمانی کۆمەكو پشتیوانیو یارمەتی لە هەموو لایەکەوە بەبڕی پارەی زۆر کۆکردنەوەی هەموو ئەو کتێبو پێداویستیانەی بۆ زانکۆ پێویست بوو کۆکرایەوە تەنانەت

منـالآنی خوێندکـاری سـەرەتایی دەخیلـەکانی خۆیـان بـۆ بـردو کردیانەدیاری.. بەم شێوەیە جارێکی تر هەر بۆ ئەوەی ئەم شارە لـە بواری فـێربوونی زانسـتو خوێنـدەواری دوانـە کـەویٚو ڕەورەوەی شارستانیەتی بەرەو پێشەوە بڕوا ساڵی ١٩٩٣ سەر لە نویٚ زانکۆی سـلێمانی دروسـتکرایەوە بـە کردنـەوەی زانکـۆ دیسـانەوە کتێبخانەیەکی گەورەش دامەزرایەوەو بە هـەزاران کتێبو گۆڤـارو ڕۆژنامەی لە خۆ گرت.

# ٤٠- كتێبخانەی سلێمانی

## ١٩٦٩ دامەزراوە

عومەر عەبدولرەحمان رەحیم

ئـەم کتێبخانەیـە لەبـەر دەرکـی سەرادایەو سەرەتای شـەقامی کاوەیـە (عومـەر عـەبدولرەحمان رەحیـم)[٩٦] بـە داوایە بۆ وەرگرتنی مۆڵەتو کردنەوەی کتێبخانەیـەك لـە سلێمانی لـە رۆژی ١٩٦٩/٦/١٠ دا رەزامـەندی کردنـەوەی ئـەو کتێبخانەیـەی وەرگـرت لـەو مێـژووە کتێبخانـەی سلێمانی دامەزرا لە سەرەتاوە تەنیا دووکانێك بوو بـەڵام لـەدوایدا توانی لەناوەوە گەورە تری بکاو جێ زێتر کتێبی تیا ببێتەوە ئێستا ئـەم کتێبخانەیـە دەوڵەمـەندترین کتێبخانەیـە دوای کتێبخانـەی گشتی سلێمانیو کتێبخانـەی زانکۆ هـەموو جـۆرە کتێبێکـی

لادەست دەکەوێ هەموو رۆژنامەو گۆڤارەکانی عێراق سەرتاسەری بۆ ئەم کتێبخانە یە دێتو دەفرۆشرێ.

ئەمە جگە لە هەموو پێداویستیەکانی تری خوێندنگاو زانکۆو بەڕێوە بەرێتیەکانی تر.

روویەکی گەشی باری رۆشنبیری شارەکە دەردەخا.

لەسەرەتای دروستبوونیەوە کەوتە چاپکردنو بڵاوکردنەوەی کتێبی کوردی وەك ئەمانە:

١- نەوای هەتیو/ ساجید ئاوارە/ ١٩٦٩ سلێمانی چاپخانەی کامەرانی (٧٤) لاپەڕە.

٢- بەهەشتو یادگار / گۆران/ چاپی دووەم/ ١٩٧١ سلێمانی چاپخانەی کامەران (٨٨) لاپەرە.

٣- دوو هاوینە گەشت/ گۆران/ ١٩٧١ سلێمانی چاپخانەی کامەران (٤٠) لاپەڕە.

٤- فرمێسك وهونەر/ گۆران/ چاپی دووەم/ ١٩٧٢ سلێمانی چاپخانەی کامەران/٩٨ لاپەڕە.

٥- سروود بۆ قوتابیان/ کۆکردنەوەی عومەر عەبدولرەحمان/ ١٩٧٣ سلێمانی چاپخانەی راپەڕین (٤٨) لاپەرە

٦- رازی تەنیایی / هەردی / چاپی دووەم/ ١٩٨٤ سلێمانی چاپخانەی

٧- دیوانی بێکەس کۆکردنەوەی محەمەد مەلا کەریم چاپی سێیەم/ ١٩٨٦ بەغدا چاپخانەی ئەدیب (٢٤٠) لاپەڕە.

# ٤١- کتێبخانەی نالی

## ١٩٦٩

(شێخ ئەنوەر)[٩٧] وەك مەحمود خاکیو مارف ناساوو جەمال محەمەد ئەمین لەسەر شۆستەکان بەڵام وەك ئەوان بەرێكو پێکی لەسەر تەختەدای نەنابوون، بەڵکو هەر لەسەر زەویەکە ریزی ئەکردن، تا خوا لێخۆشبوو ئەدیبی ناساو (عەبدوڵڵا جەوهەر)[٩٨] کە مۆڵەتی کردنەوەی

ئەنوەر ئیبراهیم رەشید

کتێبخانەیەکی بە ناوی (نالی) یەوە پیّ درا بوو (شێخ ئەنوەری)[٩٩] کردە بەرپرسو بەڕێوەبەری کتێبخانەکە کەوتبووە شەقامی کاوە تەنیشت دەرگای بازاڕی عەسری تاکیکی دەرابەی

دووکانەکەی لەناو بازارەکەدایە یانی دوو کانەکەی دوو دیو بوو، زۆری نەبرد کۆچکردو عەبدوڵلا جەوهەر بۆ شێخ ئەنوەری بە تەواوی جێی هێشت، ئەمیش هات مۆڵەتەکەی خستەوە سەرخۆیو ناوەکەی گوری کردی بە "شانۆ" بەلام هەر بەناوی کتێبخانەی نالیەوە ناسراوە ئەم کتێبخانەیە کەوتە چاپکردنو بلاوکردنەوەی کتێبی کوردیو زنجیرەیەکتێبی چاپو بلاوکردەوە:

١- راژەنینی لانکەی مرۆڤایەتی/ دکتۆر هیوا عومەر.

٢- سەرچنار/ مارف ناسراو/ ١٩٧٧ سلێمانی چاپخانەی کامەران (٤٢) لاپەرە.

٣- ببین بە تیشك /دلشادمەریوانی/ ١٩٧٧سلێمانی چاپخانەی کامەران (٨٠) لاپەرە.

٤- رازی چاوبازان/ ئیحسانی نەقش بەندی/ ١٩٧٧ سلێمانی چاپخانەیکامەران (٦٥) لاپەرە.

٥- کۆرپەی ژانی شەوانم/ عەبدولقادر سەعید/ ١٩٧٨ سلێمانی (٣١) لاپەرە

٦- گەشتی دووەمی ئەپۆلۆ/ محەمەد رەشید فەتاح/ ١٩٧٧ سلێمانی چاپخانەی کامەران (٨٨) لاپەرە.

٧- چەند مەسەلەیەکی شیعری/ شیرزاد عەبدولرەحمان/١٩٧٧ سلێمانی چاپخانەی راپەرین (٨٨) لاپەرە.

٨- چیرۆکی بێ [illegible] بەرەدەم چرای رووناکی رووداودا/ ا. ب. هەوری/ ئەبو بەکر جەلال ١٩٧٨ سلێمانی چاپخانەی کامەران (٨٠) لاپەرە.

٩- گەنجینە/ ر/ ئەحەد دلزار/ ١٩٧٩ چاپی دووەم بەغداد.
چاپخانەی بابل(١٢٨) لاپەڕە.

١١- خەندە لێو / ر: ڕەئووف ئەحمەدئالانی /١٩٨٠ بەغداد
چاپخانەی بابل (٢١٦) لاپەڕە.

# ٤٢- کتێبخانەی هونەر

## ١٩٦٩-١٩٧١

شوێنی ئەم کتێبخانەیە شەقامی گۆران بەرامبەر (ئۆرزدی باك) ی ئەوسا کە "کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی مەڵبەندی گشتی سلێمانی" دایانمەزراند ئەویش بە بڕیاری سەرۆکی کۆمەڵ (نوری وەشتی)[١٠٠] بوو کە هەر خۆشی بوو بە لێپرسراوو هەڵسوڕێنەری کتێبخانەکە لە چاوپێکەوتنێکدا وتی: ( مەبەست لە کردنەوەی زێتر خزمەتکردن بوو لە رووی

نوری وەشتی

رۆشنبیرییەوە بە کۆمەڵگای کوردەواری‌و هەرگیز بیر لە داهات‌و قازانجی بازرگانی نەکرابۆوە)[١٠١] ئەم کتێبخانەیەش هەموو کتێبە

کوردییەکانی تیا بوو لەگەڵ چەندین کتێبی جۆراو جۆر لە سەر بابەتەکانی شانۆ مۆسیقا پەیکەر سازی وێنە کێشان هتد.. هەروەها رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەوساش لێرە چنگ دەکەوت.

بەر لەوەی کۆتایی بە ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی دامەزراندنی کتێبخانەکانی شاری سلێمانی بهێنم وەك ناو هێنان تەنیا ناوی ئەو خوێندنگایانەشم تۆمار کرد کە گوایە هەر یەکەیان کتێبخانەیەکی گەورەو بچوکی تیا بووە ئەمە لە کاتێکدا کە بە دەیان ماڵی ئەوسای شاری سلێمانی لە ماڵەکانیاندا کتێبخا[illegible]ی تایبەتی خۆیان هەبووە خوالێخۆش بوو مامۆستای خەمخۆر [illegible]اجی تۆفیق پیرە مێرد هەر لە ماڵەوە کە قەڵەندەر خانەو چاپخانەو نووسینگەی رۆژنامەی (ژیان) و (ژین) بۆ کە ساڵی ١٩٢٦ کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی هەبوو.

# ٤٣- کتێبخانەی ماڵەوەی پیرەمێرد

**١٩٢٦**

پیرەمێرد

ئەم کتێبخانەیەی پیرەمێرد زۆری کتێبی تورکی‌و فارسی‌و عەرەبی بوون کەمتر کوردی تیا بوو جگە لەوەیان بەڵگە نامەو کەشکۆڵ‌و نووسراوی بە نرخی پڕ بایەخ‌و گرنگ هەندێ ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو ڕۆژگارەی لادەست دەکەوت.

# ٤٤- کتێبخانەی

# ماڵەوەی شێخ محەمەدی خاڵ

شێخ محەمەدی خاڵ

لە گەرەکی گۆیژە دیسانەوە بابانەکان خوێندنگای حاجی شێخ ئەمینیان دروست کرد حاجی شێخ ئەمین کوری شێخ ئیسماعیل بەرێوەبەری خوێندنگاکە بوو لە ناو خوێندنگاکەش کتێبخانەیەکی تیا بوو لە سەرەتای بیستەکان کە باپیرانی مامۆستای زانا شێخ محەمەدی خاڵ سەرپەرشتیاری بوون هەر لە گەرەکی گۆیژە نزیك خوێندنگا کە ماڵی جەنابی شێخ محەمەدی خاڵ کتێبخانەیەکی گەورەی دەوڵەمەندی تیادا بوو دوای ماڵئاوایی کردنی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ کەوتە دەست نەوەکانی.

# ٤٥- کتێبخانەی
# مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسوڵ
# (سەفوەت)

مەلا مستەفای سەفوەت

لەسەرەتای سەدەی بیستەوە کە بریتی بوە لە سەدان کتێبی نایابو دانسقە لە هەموو علومەکانی دینو سەدان کتێبی فارسیو عەرەبیو دەیان دیوانی شاعیرانی کوردو هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە وەك لە نامەکەی

مامۆستام پرۆفیسۆر دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوڵ دا هاتووە ئەڵێ: (من هێشتا بەشێك لە کتێبخانەکەی حاجی مەلا رەسوڵو مەلا مستەفام لاماوە (باوکم و باپیرم) کە لە مزگەوتی حاجی مەلا رەسوڵ بوو، مەلاکان سوودیان لیٚ دەبینی ئێستا مزگەوتەکە بوە بە فولکەی نالی[١٠٢] بەڵیٚ وەك لەم زانیاریەی پرۆفیسۆر دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوڵدا دەردەکەویٚ کە پاش حاجی مەلا رەسوڵ مەلا مستەفا کتێبخانەکەی بەرێوە بردووە.

مەلا مستەفا شاعیرو زاناو رۆشنبیر بووە

نازناوی شیعری (سەفوەتە) ساڵیٚ ١٩٨٥ دیوانی (سەفوەت) لە دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەلە بەغداد چاپکراوە.

# ٤٦- خانەقای مەحوی

مەلا ئەسعەدی مەحوی

کە ئەمیش هەر لە سەرەتای بیستەکانەوە دامەزراوە ئەکەوێتە خوار بازاڕی ماست فرۆشەکانەوە ئەم خوێندنگایە کتێبخانەیەکی پچووکی تیادا بوو بەڵام نەوەکانی مەحوی پەرەیان پێداو دەوڵەمەندیان کرد مەلا ئەسعەد خالید مەحوی لە سیەکانەوە بەرپرس و لێپرسراوی خوێندنگاو کتێبخانەکە بوو تا نێوانی حەفتاکان.

# ٤٧- كتێبخانە دەوڵەمەندەکەی مەلا مەحمودی حاجی مەلا عەبدولرەحمان دەرمانکوت

دوای ئەوەی ماوەیەکی چاك هاتوو چۆو سۆراخی ئەو کتێبخانە دەوڵەمەندەی کە قیبلەگای عاشقانی خوێندنو زانست بوون لە هاتوو چۆدا بووم پاشان برای نوسەرو رۆشنبیری ئازیزم مامۆستا (شێخ حسین نێرگسە جاری)[١٠٢] لە برازاکانی خوالیخۆشبو مەلا مەحمود ئەم نامە تایبەتیەم وەرگرت لەبەر گرنگی هەموو ئەو زانیاریە سەبارەت بەو کتێبخانەیە وا دەقاو دەق نامەکەی برای بەڕێزم کاك محەمەد عەتا رەشید بڵاو دەکەمەوە کە بەڕێکەوتی ١٦/٥/١٩٩٩ بۆی ناردووم لەگەڵ رێزو سوپاسو پێ زانینەدا. ئەمەش دەقاو دەق نامەکەی کاك محەمەد.

(مەلا مەحمود کوڕی حاجی (مەلا عەبدولرەحمانی دەرمانکوتە) کوڕی ئیسماعیل کە یەکێك بووە لە مریدەکانی (کاك ئەحمەدی شێخ) کوڕی مەلا یوسف، ئەم بنەماڵەیە وەچە دوای وەچە عاشقی زانستو زانین بوون.

مەلا مەحموود ئامۆزای (مەلا حەمدونی) شاعیری نابینایە.

منی برازای مەلا مەحمود لە سەرەتای ژیانمەوە پەروەردەی ناو کتێبخانەکەی بووم، هەموو رۆژێك جگە لە فەقێکانی خۆی چەندین

کەڵە زانای ئاینی وەك (مەلا مەحمودی بێخوود) و (شێخ نوری بابا عەلی)و (مەلا عەبدوڵڵای چورستانی) دواتریش شێخ مستەفا قەرەداغی‌و دەیان مەلای ناوشارو ناوچەکانی تری کوردستان سەردانی ئەم کتێبخانە دەوڵەمەندەیان دەکرد کە پڕ بوو لە دانسقەترین کتێب لەزانستەکانی کلام، منگق، فقە، حدیپ، نحوو، صرف..هتد.

کتێبخانەکە لە (٢٥) تاق زیاتر بوو پترلە (٢٠٠٠) کتێبی تێدا بوو، کتێبەکانی مەلا مەحموود لە ناو زانایاندا بە ناوبانگ بوو.. چ لە رووی دانسقەیی‌و چ لە بەرگ‌و پاراستنیدا، فەقێکانی ئەو لە دوا قۆناغی خوێندندا بوون بەردەوامیش لە (١٠) فەقێ کەمتر نەبوون، لە پێش هاتنی رێزدار (مەلا عەبدولکەریمی مدرس) لە بیارەوە بۆ سلێمانی مەلا محمود لە مزگەوتی (حاجی ئەحان) و (مەلا عەلی نیزامی) بەرەسمی مدرس بوو دەرسی بە خوێندکاران دەگووت بەڵام دوای هاتنی ئەو مزگەوتی حاجی ئەحان بەرەو ئەو رێزدارە کرایەوەو خۆی هەر لە مزگەوتی مەلا عەلی نیزامی بە پێش نوێژو (مدرس)و دەرس وتنەوە خەریك بوو.

ئەم کەڵە زانایە لە ساڵی ١٩٥٥دا کۆچی دوایی کرد، کتێبخانەکەشی لە پاش خۆی وە لە ژێر سەرپەرشتی یەکێ لە مەلاکانی سلێمانیدا کرا بە دوو بەشەوە بەشێکی بۆ کچەکەی مەلا محمود دانرا کە بەکتێبخانەی خوا لێخۆشبوو شێخ مارفی قەرەداغیان سپارد، بەشەکەی تری بۆ مەلا رەشیدی برای دانرا، لای ئێمە مایەوە تا مردنی باکم لە ساڵی ١٩٥٨ دا، ئێمەش دوای

مردنی باوم سپاردمان به کتێبخانەی مەلا عەبدوڵلا ی چورستانی وەك ئەمانەتو ئێستاش لەوێ پارێزراوە، بەڵام دەربارەی بەشەکەی لای شێخ مستەفا قەرەداغی هیچ زانیاریەکمان نییە.

زۆریەی ئەو کتێبخانەیە بە راقەو شەرحی تایبەتی مەلا محمودیش رازابۆوە، لە کۆتایی هەموو حاشیەو شەرحێکدا دەینوسی: (محمود یان یەعقوبی).

ئەمە بە کورتی دەربارەی (مەلا مەحمودی حاجی مەلا عەبدولرەحمانی دەرمانکوت) کتێبخانە دەوڵەمەندو قەشەنگەکەی، کە بۆنیو سەدە کەلکی لێ وەرگیراو قیبلەگای زاناو عاشقانی زانست بووە).

# ٤٨- خوێندنگای

# خانەقای مەولانە خالید نەقشبەندی

لە گەرەکی دەرگەزێن مەحمود پاشای ئەورەحمان پاشای بابان ١٨١٨ دا دروستی کردووەو مەولانە خالید دەرسی تیا وتۆتەوەو سەرۆکاری کتێبخانەکەشی کردوە دوای ئەو مەلا موسی و دواتر شێخ عومەری قەرەداغی بەرێوەی بردووە لەم دواییەشدا، مەلا عەبدوڵلای چورستانی بەر پرس و ئەمینداری بوە، هەموو ئەو کتێبە ئاینیانە بون کە ئەو سا هەبووەو تا ئەمڕۆ ماون.

# ٤٩- خوێندنگای موفتی

لە گەرەکی گوێژە لە شەقامی کاوە بە تەنیشت (دەرمانخانەی شەوکەت) ی ئێستا کۆلانێك کە بۆ بازاڕی دۆلارەکە ئەچێ ئەو بازاڕ خوێندنگای موفتی [illegible] کە بە ناوی (مەلا ئەحمەد چاومارەوە) بە ناوبانگ بوو لە ساڵی ١٩٤٧ دا مەلا مەحمودی بێخودی شاعیر کاروباری ئەم خوێندنگایەی بەرێوە ئەبرد لەگەڵ پاشماوەی ئەو کتێبانەش کە پێشتر کتێبخانەیەکی دەوڵەمەند بوو بەر لە هاتنی ئینگلیزەکان بۆ سلێمانی و بە فڕۆکە بۆردومانی سلێمانیان کرد (یەکەم بۆمبایەك کە لەو شارە درابێ بەرماڵی موفتی و ئەو کتێبخانە بە قیمەتە کەوتوە)(١٠٤)

ئەمە جگە لەوەی (بەچەند هەفتەیەك موفتی سێ بارکتێبی دەگمەنی نارد بۆ دێی (وێڵە دەر) ئەو کاتە شێخ لەوەێ ئەبێ کەچی بۆ بای بێوڵەتی و لە بەختی رەشی ئەو کتێبانە دوای چەندانێك ئەو دێیەش بەر ڕق و کینەی داگیر کەرانی چاوشین بۆردمان ئەکرێت و یەکەم دانە بۆمبایەك بەر خوێندنگاو کتێبخانەکەی ئەکەوێ و ئەبێ بە سوتتەمەنی)(١٠٥) ئێستا نە شوێنەواری ماوەو نە کتێبخانەکە.

# ٥٠- کتێبخانەکەی ماڵی ساڵح قەفتان

ماموّستا ساڵح قەفتان

من خۆم بە دەیان جار بەناو ئەو کتێبخانە گەورەیەدا گەڕاوم کە لە نهۆمی سەرەوەی ماڵی مامۆستای خوالێخۆشبو ساڵح قەفتان دا بوو لە شەستەکاندا داخم ناچێ ئەو کاتەمن هیچ هۆشیارییەکی ئەوتۆم نەبوو تا بزانم کتێبەکان چی بوون تەنیا بە هەر چوار دیواری ژوورێکی گەورە دا لە ئەرزەکەوە تا بن میچەکەی سیخناخ بوو لە کتێب بەڵام کەس قەرەی ئەو ژوورە نەئەکەوت لەبەر تەپوتۆزو خۆڵێکی زۆر لەسەر یان هەروەهاماڵی توفیقە فەندی قەفتان‌و نوری فەندی قەفتان باوکی بەڕێز دکتۆر

کاوس قەفتان هەر یەکە لە ژوورێکدا کتێبخانەیەکی گەورەیان هەبوو بەلام ئەمان هەموو ئاخنرابوونە دۆلاب‌و سندووقەوە بڕواناکەم ئەو کتێبانە مابن چونکە زۆر بی نازو تەریو ئەم دین ئاو کاتە

# ٥١- کتێبخانەی ماڵەوەی مامۆستای خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی بەگ

کە بەسەدان کتێبی دانسقەو نایاب‌و کەم وێنەی پڕ بایەخی تیا بوو پاشان بەخشی بە کتێبخانەی گشتی سلێمانی.

# ٥٢- کتێبخانەی خوالێخۆشبوو مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر تۆفیق

کە ئەویش هەر لە سەرەتای لاوی‌یەوە دروستی کردبوو پڕ بوو لە کتێبی پڕ بایەخ‌و سەرچاوەی بەنرخ‌و ئەمیش وەك ئەرکی پیرۆزی خۆی هەموو کتێبخانەکەی بە خشی بە کتێبخانەی گشتی سلێمانی.

چەندین ماڵی تر هەن کتێبخانەی دەوڵەمەندیان هەبووە وەك سەرچاوەیەکی، گرنگی رۆشنبیری کەلکی لێ وەرگیراوە.

ئەمە ئاوڕدانەوەیەكی مێژوویی كورتی دامەزراندنی كتێبخانەكانی شاری سلێمانی بوو لە تەمەنی ئەم حەفتا ساڵەیدا كە درێخی نەكردووە لە گەشە پێدانو خزمەتكردن لە رووی رۆشنبیریو زانستەوە ئەویش بە كردنەوەو دروست كردنودامەزراندنی چەندین كتێبخانە لەم شارەدا. كەواتە جێی خۆیەتی لێرەدا سەری رێز بۆ ئەوانە دانەوێنین كە رۆژێ لە رۆژان لاپەرەیەك یان كتێبێكیان چاپو بڵاوكردۆتەوە بۆ زیاتر هۆشیار كردنەوەی كۆمەڵی كوردەواری جارێكی تریش رێزو سوپاسو پێزانین بۆ هەموو ئەو بەڕێزو دڵسۆزانەی بە پیرمەوە هاتنو یارمەتیان دام لە نوسینەوەی ئەم كتێبەدا.

**مارف ناسراو**

١٩٩٩/٣/٢٧

# پەراوێزەکان

١)تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامەنوسی کوردیدا د. کەمال مەزهەر ئەحمەد ‌/١٩٧٨ لاپەڕە (٢٢-٢٣).

٢) راپۆرتێك سەبارەت بە نامەخانەو دەستنوسەکان مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ / سلێمانی چاپی رۆنیۆ/ سالی چاپ دیاری نەکراوە.

٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤) گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە /١٠٢/ تەموزی ١٩٨٤ لاپەڕە (١٠٦) مەحمود ئەحمەد محەمەد.

٥) سەرچاوەی پێشوو

٦) تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامەنوسی کوردیدا د. کەمال مەزهەر ئەحمەد/ ١٩٧٨ لاپەڕە (٤٥).

٧) شاری سلێمانی بەرگی دووەم/ ئەکرەمی مەحمودی سالحی رەشە / لاپەڕە (٨٢)

٨) گۆڤاری رۆشنبیری نوێ / ژمارە ١٠٢ تەموزی ١٩٨٤ لاپەڕە ١٠٧ مامۆستامەلا مەحمود ئەحمەد محەمەد.

٩)کەریم سالح محەمەد ئەمین سالی ١٩٠٧-١٦/٢/١٩٨٥

١٠)گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە ١٠٢-تەمووزی ١٩٨٤ لاپەڕە (١٠٧) مەحموود ئەحمەد محەمەد.

١١)گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە ١١٠ / حوزەیرانی ١٩٨٦ لاپەڕە (٢٣٤) لەتیف قەرەداغی.

١٢)مەلا عەزیز کوری مەلا عەلی کوری مەلا ئەحمەدی برایمی قولە رەش یە لە سالی ١٩٢٤ لە شاری سلێمانی لە دایك بووەلە سالی ١٩٩٨ کۆچی دوای کردووە ، لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ بەرێز کاك شادمان رۆژی ١٥/١١/١٩٩٨ .

١٣) قادر ئاغای عەتتار خۆی ناوی قادر سەعید عومەرە بە قادر ئاغای عەتتار بەناوبانگ بوو لە سلێمانی لە سالی ١٨٨٢ لە دایك بووەو لە ١٩٧١ مالئاوایی کردوە.

١٤) گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە /١١٠ ی حوزەیرانی ١٩٨٦ لاپەڕە (٢٣٦) لەتیف قەرەداغی .

١٥) عوسمان محەمەد نادر سالی ١٩١٠ لە سلێمانی لە دایك بووە . لەچاوپێکەوتنێکدا لە مالی خۆیان رۆژی ٢٣/٦/١٩٩٧ بە ئامادەبوونی بەرێز کاك

فوئادی کوڕی ئەوەی راست کردەوە کە چەند جارێك بە هەڵە ساڵی لە دایك بوونی تۆمار کراوە.

١٦) سەرچاوەی پێشوو

١٧) هەمان سەرچاوە

١٨) رۆژنامەی پێشکەوتن ژمارە /٨٩/رۆژی پێنج شەمە، ٥/١١/١٩٢٢ لاپەڕە (٤).

١٩) رۆژنامەی رۆژی کوردستان ژمارە /٢/ی ساڵی یەکەم ٢٢/١١/١٩٢٢ لاپەڕە (٤).

٢٠) رۆژنامەی پێشکەوتن ژمارە/٩٨ ی ساڵی دووەم رۆژی ٩/٣/١٩٢٢ لاپەڕە (٥).

٢١) رۆژنامەی بانگی کوردستان ژمارە /٧ی ساڵی یەکەم ٢٢/٩/١٩٢٢ لاپەڕە (٦).

٢٢) نەجمەدین مەلا یاخوت مەلا نەجمەدین کە بە هەردو ناو بەناوبانگ بوو کوڕی مەلا غەفوری کوڕی مەلا عەلی‌یە لە سلێمانی لە ساڵی ١٨٩٨ کە بەرامبەر لە دایك بونی یەکەم رۆژنامەی کوردی‌یە ئەویش ( کوردستان) ی میقداد مدحەت بەدرخانە کە لە ٢٢ ی نیسانی ١٩٨٩ یەکەم ژمارەی دەرچوە ، لە رۆژی دوشەمەی ٢٣/٤/١٩٦٢ لە حوجرەکەی دوای چەند رۆژێك کە بێ سەرو سۆراغ بوو تەرمەکەی دۆزرایەوە . لەسەر وەسیەتی خۆی ساڵی ١٩٧٠ بە ئاهەنگ و کەژاوەیەکی قەشەنگ و شکۆدارەوە گوێزرایەوە بۆ چیای ئەزمر.

٢٣)مامۆستا عومەر مەعروف بەرزنجی ئەڵێت:"زیاتر لە (٢٠٠) دانە بە دەستخەت لە دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگ صاحیبقرانی نووسیوەتەوە"

٢٤) یەکێك لەدڵسۆزەکانی چاپکردنی دیوانی حەمدی وەك پاسەوانێك بە پەرۆشەوە هەوڵی لە چاپدانی داوە مەلا نەجمەدین بووە " گۆڤاری بەیان ژمارە (١٨١) ساڵی ١٩٩٨ لاپەڕە ٣ دکتور کەمال مەزهەر ئەحمەد.

٢٥)رابەری رۆژنامەگەری کوردی/جەمال خەزنەدار/ ١٩٧٣ لاپەڕە (١٤٣)

٢٦)چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز عوسمان حەمە نادر رۆژی ١٢/٤/١٩٩٨.

٢٧) رەمزی قەزاز/ غەوفوری میرزا کەریم ئەڵی:" خۆی ناوی محمد محیّ‌الدین"

٢٨)زانیاریم لە بەڕێز کاك ئەکرەمی مەحمود ئەفەندی ساڵحی رەشە خاوەنی سینەمای رەشیدی ئێستا وەرگرت.

٢٩) کۆمەڵی زانستی سلێمانی/غەفوری میرزا کەریم/ ١٩٨٥

٣٠) رۆژنامەی ژیان ژمارەکانی/ ١٦، ١٧، ١٨، ٢٠، ٢٣، ٢٥، ٢٦/ ساڵی ١٩٢٦

(٣١)زانیاریم لە نامەیەکی بەرای رۆژنامە نووسم کاک هێرش محەمەد ئەمین کە رێکەوتی ١٩٩٨/٩/٢٤ بۆی ناردم وەرگرت کە خۆی پەیوەندییەکی نزیکی هەیە لەگەڵ بنەماڵەی مەلا رەحیمدا.

٣٢) سەرچاوەی پێشوو

٣٣) بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥- ١٩٦٩/ عومەر مەعروف بەرزنجی/١٩٧٨ لاپەرە (٧٣)پەراوێزی (٩٤) دا ئەڵێت:" مستەفا سائیب شاهۆ (کوردی) یەکێکە لە نووسەرەکانی سالانی پەنجا بە ناوی خۆی هەروەها لە ژێر ناوی (زەکی سائب) (کوردی) دا بەرهەمی بلاوکردۆتەوە سالی ١٩٢٠ بە پەخشانی (بۆ چروك) پاداشتی دووەمی رۆژنامەی (پێشکەوتن لیٚ وەرگرت).

٣٤) بیبلۆگرافیای کتێبی کوردی/ مستەفا نەریمان/ ١٩٧٧ هەروەها بیبلۆگرافیای دووسەد سالەی کتێبی کوردی/ مستەفا نەریمان/ ١٩٨٦.

٣٥) مەلا سالح زوبێر/ لە سالی ١٨٩٠ لە دایك بووە لە گەرەکی سەرشەقام لە سلێمانیو سالی ١٩٦٠ کۆچی دوایی کردووە.

٣٦) نامەی بەرێز پرۆفیسۆر د. عزەدین مستەفا رەسولٚ رێکەوتی ١٩٩٩/٤/٢٦.

٣٧) مەلا نوری/ ناوی خۆی محەمەد نوری عەزیز عەبدوللایەو ناسراوە بە مەلا نوری عەزیزی ماستاو لە چاوپێکەوتنێکدا رۆژی ١٩٩٩/٤/٢٦ لە کتێبخانەکەی خۆی لە (عەقاری) ئەم زانیارییەی پێدام.

٣٨) مەلا سالی عەبا بەیلیەی سالی لە دایك بونی نەزانراوە، بەلاٚم ١٩٦٥ دا مالئاوایی کردوە.

٣٩) لە چاوپێکدا لە رۆژی ١٩٩٨/١١/٢٠ لەگەڵ بەرێز مامۆستا حەمە بۆر(هۆشەنگ).

٤٠) بیبلۆگرافیای کتێبی کوردی/ مستەفا نەریمان/ ١٩٧٧.

٤١)بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٩/ عومەر مەعروف بەرزنجی/١٩٧٨ لاپەرە (٨٠) پەراوێزی (٩٧) دا دەڵێت: مەحمود ئەحمەد (ئازاد) ١٩١٧ لە رەواندز لە دایك بووە، نوسەرو خەباتکەرێکی نەترس بووە لە سەرەتادا کتێبی گوڵالەو نادەمیزادلە سایەی دەربەگیدا سالی ١٩٤٧ چاپکردووە سالی ١٩٦٠ بە چیرۆکی (جوان) هاتەوە مەیدان لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەی خۆییدا بەرهەمی بلاوکردۆتەوە).

٤٢) لە چاوپێکەوتنی رۆژی ١٩٩٩/٣/٢٥ لەگەڵ بەرێز غەفووری میزا کەریم لە مالی خۆیان وتی: (محەمەدخدر کۆیی) کە بەحەمەی تاپۆ بە ناوبانگ بوو، چونکە خۆی

فەرمانبەری فەرمانگەی تاپۆی ئەوسا بوو، لە کۆتایی سیەکانەوە وەك ئەندامێکی چالاك و دڵسۆز کاری سیاسی ئەکرد لە کۆمەڵەی برایەتیدا.

٤٣) رۆنامەی ژیان ژمارە/ ٥٤٥ی ٢٠ کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٧ لاپەڕە (٤)

٤٤) مەحەمەدفەتاح کە بە حەمەی مەکتەبە بەناوبانگە لە سلێمانی ساڵی ١٩٤٠ لە دایك بووە فەرمانبەرێکی تابلێی دڵسۆزو ئیشکەری کتێبخانەی کوردییە لە رۆژی ١٩٩٨/١/٢٧ لە چاوپێکەوتنێکدا ئەم زانیاریانەم لێ وەرگرت.

٤٥) هەمان چاوپێکەوتن.

٤٦) رۆژنامەی هاوکاری ١٩٧٨/٧/٣١.

٤٧) رۆژنامەی ئاسۆ /١٩٨٩ ژمارەی نەزانرا.

٤٨)رۆژنامەی ژیان ژمارە/ ٥٥٢ ی ١٩٣٨/٣/٣ لاپەرە (٣)

٤٩) جێگای هونەرمەندان/ مەبەستی بارەگای کۆمەڵی هونەرە جوانەکانی ئەوسا بوو.

٥٠) لە نامەکەی مامۆستا عومەر عەلی ئەمین کە رۆژی ١٩٩٩/٢/٢٨ بۆی ناردم.

٥١) رۆژنامەی ژین ژمارە/١٣١٠ لە ١٩٥٦/٨/٣٠دا.

٥٢) رۆژنامەی ژین ژمارە/ ٧٦٠ پێنج شەممە ١٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٤.

٥٣) محەرەم محەمەد ئەمین لە ساڵی ١٩٤٨ بۆ ١٩٤٩ ئەمینداری کتێبخانە بوو پاشان گوێزراوەتەوە بۆ دەڵتاوا ئەم زانیارییەم لە مامۆستا عومەر مەعروف بەرزنجی وەرگرت.

٥٤) عەبدولکریم عارف ئەحمەد لە گەرەکی حاجی ئەحان لە مەلکەندی شاری سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٥ لە دایك بوە لە ساڵی ١٩٤١ چۆتە خوێندنگای مەلکەندی و پاشان چۆتە ناوەندی چوار باخی ئەوسا کە مامۆستا موسا سەمەد بەڕێوەبەری بوو تا چواری دوا ناوەندی مەعفوی عام بووە لە ساڵی ١٩٥٦ دا قانوون و ئیدارەی تەواوکردو بویە ئەمینداری کتێبخانەی گشتی سلێمانی دواتریش لە بەغدا کۆلیژی مافی تەواو کرد، بەلام بەداخ و پەژارەیەکی زۆرەوە ئەم رۆشنبیرە لە بەغدا ساڵی ١٩٦٢ لە روباری دیجلەدا خنکا.

٥٥) محەمەد ساڵح دیلان/ محەمەد ساڵح کوڕی مەلا ئەحمەدی مەلا ساڵح مەلا قادرە لە ساڵی ١٩٢٧ لە گەرەکی گۆیژەی سلێمانی لە دایك بوە، هەر لە سەرەتای منالیەوە خراوەتە حوجرەی مامۆستا شێخ بابا عەلی "دواتر خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی تەواو کردووە لە ساڵی ١٩٤٦ دا دامەزراوە بە لێپرسراوی گەنجینە لە بەڕێوەبەرایەتی کارو

باری تووتن لە سلێمانی. ساڵی ١٩٤٩ گیراوەو دوورخراوەتەوە دەست بەسەر بووە، زۆر ئەشکنجەو سزای بەندیخانەی چەشتووە دواجار کراوە بە ئەمینداری کتێبخانەی گشتی سلێمانیو لە ٢٨/١٠/١٩٩٠ دا ماڵئاوایی کردوە لە بەرهەمە چاپکراوەکانی دیلانی شاعیرو هونەرمەندی دەنگخۆش ئەم کتێبانەی بلاوکردەوە.

١- شەڕو ئاشتی ١٩٥٤.

٢- کونەپەپوی شەڕ ١٩٥٤.

٣- شێخ مەحمودی زیندوو١٩٥٨.

٤- دیلان /١٩٦٩.

٥- پازی جاران/١٩٧٣ ، بۆ دواجار دیوانی شیعر ١٩٧٨ کە سەرجەمی شیعرەکانی بوو.

٥٦) رۆژنامەی ژین ژمارە/ ١١٢٢ای ٦ی تشرینی دووەمی ١٩٥٢.

٥٧) رۆژنامەی ژین ژمارە/١١٢٧ای کانوونی یەکەمی ١٩٥٢.

٥٨) رۆژنامەی ژین ژمارە/١١٣٥ای ٥ی شوباتی ١٩٥٣.

٥٩) رۆژنامەی ژین ژمارە/١٢٨٨ای ١٥مارتی ١٩٥٦.

٦٠) رۆژنامەی ژین ژمارە/١٣٢٠ای ٨/١١/١٩٥٦.

٦١) گۆڤاری رۆژی نوێ/ ژمارە (١١) شوباتی ١٩٦١ ساڵی یەکەم لاپەڕە (٥٥).

٦٢) رۆژنامەی هەرێمی کوردستان ژمارە/١٠٤/ پێنج شەمە ٢٢/١٠/١٩٩٨ لاپەڕە (٥).

٦٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٦٤) هەمان سەرچاوە.

٦٥) زۆربەی زانیاری ئەم کتێبخانەیەم لەو نامەیەدا کە مامۆستای هونەرمەند عومەرعەلی ئەمین بۆی ناردم لە ٢٨/٢/١٩٩٩ وەرگرت.

٦٦) کەریمی سۆفی/ خۆی ناوی کەریم محەمەد محێدینە) یەکێك بوو لە لاوەخوێنە گەرمەکانو تێکۆشەرێکی ئازای پارتی تحرری وەگهنی سەر بە حیزبی شیوعی عێراق بوو، هەر لە تەمەنی شانزە ساڵییەوە زۆر چالاکانە وەك نیشتمانپەروەرێکی خەباتگێڕ دەوری سەرکردایەتی ئەوسای بینیوە چەندین جار پەیوەندی راستەوخۆی بوە لەگەڵ هاوڕێ (فەهد).

کەریمی سۆفی زۆر چاو نەترسانە هەستا بە دامەزراندنو کردنەوەی کتێبخانەیەك بە ناوی (بیری نوێ) بەبێ مۆڵەتی یاسایی رژێم واتە ئاسایشی ئەو سا وەزارەتی ناوخۆ هەر خۆی سەرپەرشتیو لێپرسراوی کتێبخانەکە بوو دوو نیشتمانپەروەری ئەندامانی پارتی تەحرری وەگهنی کە مامۆستایان عومەری عەلی ئەمینو خوالێخۆشبوو ئەحمەد غەفوور

بوو بە هەرسێکیان بەرێوبیان ئەبرد. کاتێکیش کتێبخانەکەیان پێ داخرا شەهید کەریمی سۆفی کەوتە خۆشاردنەوە لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ کون بە کون پیاوانی ڕژێم ئەوسا لە دووی ئەگەڕان تا لە ڕێی سیخوڕێکەوە شوێنەکەی دەست نیشانکراو هەڵیان کوتایە سەری کە لە ماڵی (ئەورەحمانی سالحی خلە لە گەڕەکی چوارباخ، نزیك مزگەوتی مەحوی)، گیراو پاش ئەشکەنجەو ئازاردانێکی زۆر توشی نەخۆشی (سیل) بوو ڕۆژ بە ڕۆژ تەندروستی خراپتر ئەبوو بێ ڕەحمانە ڕەوانەی دادگای عورفیان کرد لە بەغداد ئەو بەیانیەی کەریمی سۆفی تیا ڕەوانە کراوە ڕۆژێکی ساردو سەرماوکرێوەو تۆفو بەفر باران بوە بە تۆپی یەك بیجامەو کراسەوە لە پشتی سەیارەیەکدا نەیان هێشت هیچ بە تانی وجلێك لەگەڵ خۆی بەرێوەبەرێ بەڕێز خاتوو ناجی خوشکی شەهید کەریم گێڕایەوە تا ساڵی ١٩٤٨ پاش ماوەیەك سەعاتو هەندێ شتیمان بۆ هاتەوەو پیان ڕاگەیاندین کە لە نەخۆشخانەی (حومەیات) کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەشمان وەرنەگرتەوە.

٦٧)چاوێکەوتن لەگەڵ بەڕیز مامۆستا عومەری عەلی ئەمین ١٩٩٩/٢/١١ پاشان ئەم زانیاریانەی لە نامەیەکدا بۆ ناردم بە مێژووی ١٩٩٩/٢/٢٨.

٦٨)چاپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز مامۆستا ناجی خوشکی شەهید کەریمی سۆفی ڕۆژی ١٩٩٩/٥/٣ لە ماڵی خۆیان وێنەی شەهیدیشم لێ وەرگرت.

٦٩) کاك سدیق سالح لاوێکی ڕۆشنبیرو دڵسۆزە ئێستا لە (ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان) کاردەکا.

٧٠) ڕۆژی ١٩٩٩/١١/١٥ هاوڕێی خۆشەویستم کاك سدیق سالح دوانزە بەڵگە نامەی لەسەر کتێبخانەی ڕووناکی بۆ فۆتۆکۆپی کردم کە زۆربەی زانیاریم لەو بەڵگەنامانەوە وەرگرت.

٧١) هەمان نامەکە ڕۆژی ١٩٩٩/٢/٢٨ لە بەڕێز مامۆستا عومەر عەلی ئەمینم وەرگرت.

٧٢) مەدهۆش (محەمەد عەلی کوڕی سۆفی محەمەد حاجی مستەفا پاشای قوربانییە ساڵی ١٩١٩ لە شاری سلێمانی هاتۆتەوە دنیاوە، لە شیعرو چیرۆکدا بەرهەمی بەدەستەوە داو چەند چیرۆکێکی بە چاپ گەیاندووە/ بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥- ١٩٦٩ عومەر مەعروف بەرزنجی پەراوێزی (٢١٧).لاپەڕە (١٣٤) وە لە شوباتی ١٩٩٤ ماڵئاوایی کرد.

مەدهۆش لە ژیانیدا ئەم کتێبخانەشی بە چاپ گەیاندوەو بڵاوکردۆتەوە.

١-دڵو گوڵ ٢- سەرگوڵ ٣- هەمیشە بەهار ٤- نەریمان چی لێ هات ٥- شیرین ٦- دڵی کچان ٧- دڵی کوڕان پاشانیش سەرجەمی شیعرەکانی لە ژێر ناوی یانەی دڵان بڵاوکردەوە.

٧٣) شێخ حەسەن شێخ حەمە مارف/ لە ساڵی ١٩١٧ لە دایك بووە لە چلەکانەوە نوسەرو رۆژنامە نوس بوە لە گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە" لە رادیۆی کوردی بەغداد وەرگێرو وتە بێژ بوە مامۆستای زمانی کوردی بوو لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی بەغداد/ رۆژنامەی هەرێمی کوردستان ژمارە /٣٤ لە ١٩٩٧/٥/٢١ خولی دووەم نوسینی/ کامیل ژیر).

٧٤) [illegible] گۆران/ کوری شاعیر [illegible] لە ساڵی [illegible] لە سلێمانی لە دایك بوە [illegible] لە ساڵی ١٢[illegible] [illegible] کتێبخانەی [illegible] سلێمانی ئێستا رۆژنامە نوسە لە رۆژنامەی هەرێمی کوردستان لە سلێماتی.

٧٥) هۆگر گۆران/لە ساڵی ١٩٣٤ لە سلێمانی لە دایك بووە.

٧٦) لەو چاپێکەوتنەدا کە لە رۆژی ١٩٩٩/٤/٢٦ لە کتێبخانەکەی خۆی لە عەقاری کردم وتی: "ناوم محەمەد کوڕی مەلا نوری کوڕی عەزیزی عەبدوڵلای ماستاوم لە سلێمانی لە دایك بووم لە رۆژی رەشی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠ لە گەرەکی سەرشەقام" بە منالی خراومەتە حوجرە لای مەلا حەسەنە شێتە، لە نێوان چلەکانەوە چومەتە خوێندنگای ئەوسای شەو لە خوێندنگای فەیسەلییە. زۆر لە کەشکۆڵ و بەڵگە نامەی مێژوویم لایە زۆریشم فەوتاون)

٧٧)محەمەد عارف مەعروف/ لە ساڵی ١٩٣٤ لە گەرەکی کانێسکان لە شاری سلێمانی لە دایك بوە لە چاوپیکەوتنکیدا کە رۆژی ١٩٩٨/١١/١٧ لەگەڵیا کردم ئەم زانیاریانەم لێ وەرگرت.

٧٨) هاوار / خۆی ناوی محەمەد رەسوڵەو ناسناوی شیعری (هاوار) ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە لە ٣ی ئەیلولی ١٩٢٣ لە سلێمانی لە دایك بووە، پاش تەواو کردنی ئامادەیی لە ساڵی ١٩٤٤ دابوە بە فەرمانبەر لە بەڕێوەبەرایەتی (انحصار) لە سلێمانی پاش چەندین جار گواستنەوە تا ساڵی١٩٦١ لە بەغداد گیرسایەوە ساڵی ١٩٦٩ کۆلێژی تەواو کردووە ساڵی ١٩٧٤ فەرمانبەری میری بەجێ هێشتووەو بەشداری شۆرشی کوردستانی کردووە ساڵی ١٩٧٥ گەراوەتەوە بەغدادو ساڵی ١٩٨٠ بە ماڵ و منداڵەوە چۆتە لەندەن [illegible] کتێبی /کوێرەوەری و بیرەوەری هاوار ( ١٩٨٤/ لەندەن/ لاپەرە٣-٤).

٧٩) چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێز/ بەکری شێخ عەزیز باراوی رۆژی ١٩٩٨/١٢/٣٠.

بەکر شێخ عەزیز باراوی لە گەرەکی کانێسکانی لە سلێمانی ساڵی ١٩٣٤ لە دایك بووە.

٨٠) زانیاری/ مامۆستا عومەر مەعروف بەرزنجی لە چاوپێکەوتنێکدا رۆژی ١٩٩٨/١٠/١٨

٨١) بەرگی پشتەوەی گۆڤاری هیوا ژمارە/٩/ ١٠ سالّی دووەم نیسان و مایسی ١٩٥٩

٨٢) سالار مەجید سالّح لە شاری سلێمانی سالّی ١٩٤٢ لە دایکبوە/ چاوپێکەوتن لە هۆڵی خوێندنەوەی کتێبخانەی شوێنەوار ١٨/٤/١٩٩٩

٨٣)هەر هەمان چاوپێکەوتن.

٨٤) ئەخۆل/ناوی خۆی ئەحمەد دەروێش عەبدوڵلایە برای شاعیری کۆچکردوو (کامەران موکرییە) لە سالّی ١٩١١ لە گەرەکی دەرگەزێنی سلێمانی لە دایکبوەو لە ١٩٨٨/٩/٢٩ مالئاوایی کردووە لە بەرهەمە چاپکراوەکانی تا ئەمڕۆ ئەمانەن.

١-پەیمان و شیوەن/ئەخۆل/١٩٧٠ سلێمانی چاپخانەی راپەڕین (٧٦)لاپەڕە

٢- دیوانی ئەخۆل/ئەخۆل/١٩٨٣ بەغداد چاپخانەی ئەدیبی بەغدادی.

٨٥)حاجی حەسەن فەتتاح سەعید لە سالّی ١٩٢٤ لە دایک بووەو لە ١٩٩١/٣/١١ مالئاوایی کردووە.

٨٦)کاکەی فەللاح/ ناوی خۆی حەمە حەمە ئەمین قادرەو بە کاکەی فەللاح وەك شاعیرێك بەناوبانگە لە سالّی ١٩٢٨ لە دایك بووە لە کۆڕی تێکۆشانا گرتن و راونانی زۆری بینیوە ئەشکەنجەو سزای زیندانەکانی" نوگرە سەلمان و ئەبو غرێبی" زۆر چەشتووە لە سالّی ١٩٧٤ لە دەزگای چاپ وبلاوکردنەوەی کوردی" لە بەغداد لە گۆڤاری بەیان وەك نووسەرو رۆژنامە نووس و لێپرسراوی گۆڤارەکە دانراوەو سەرپەرشتی لاپەڕەی (ئەدەب و ژیان)ی رۆژ نامەی هاوکاریشی دەکرد پاشان لە سالّی ١٩٧٦ بو بە بەڕێوەبەری دەزگای پەخش و بلاوکردنەوە (دار الوطنیة) لە سلێمانی هەر پاش سالێك وازی هێناو خۆی خانە نشین کردو گەڕایەوە سەر چاپخانەکەی لە سلێمانی. سالّی ١٩٩٠ مالئاوایی کرد.

٨٧) مارف ناسراو/ ناوی مارف کەریم سالّح محەمەد ئەمین)ە لە ١٩٤٣/٣/٢٩ لە گەرەکی کانێسکان لە دایکبووە.. ئێستا لە وەزارەتی رۆشنبیری لە رۆژنامەی هەرێمی کوردستان وەك رژنامە نووس کار دەکا.

٨٨) گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە (١٠٢) سالّی ١٩٨٣ لاپەڕە (١١٤) (ئاوێنەی ژینم) شاکر فەتاح.

٨٩) سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە(١١٦)

٩٠) رۆژنامەی (خورمال)شاکیر فەتاح زنجیرەی ژمارە (٥٥) سالّی ١٩٨٣

٩١) رۆژنامەی (باسرە) شاکیر فەتاح زنجیرەی ژمارە (٧٧) سالّی ١٩٨٥

٩٢) رۆژنامەی (چنچەمالّ) شاکیر فەتاح زنجیرەی ژمارە (٥٥) سالّی ١٩٨٣

٩٣) ) رۆژنامەی (ئاکرێ) شاکیر فەتاح زنجیرەی ژمارە (٦٥) سالّی ١٩٨٤

٩٤) نهاية انسان مرموق (بقلم طه بابان المحامي/ صحيفة الاتحاد العدد (٢٦٩) ص ١٥ في ٣٠/٥/١٩٩٨.

٩٥) جەمال محەمەد ئەمین ساڵی ١٩٤٥ لە گەڕەکی گۆیژە لە سلێمانی لە دایك بووە چاوپێکەوتنی ڕۆژی ٩/١٠/١٩٩٧ ئەم زانیاریانەم لێ وەرگرتت.

٩٦) عومەر عەبدولرەحمان ڕەحیم لە گەڕەکی کانێسکان لە سلێمانی ساڵی ١٩٣٥ لە دایك بووە ڕۆژی ١٠/٩/١٩٩٨ لە چاوپێکەوتنێکدا لە کتێبخانەکەی خۆی سەر لە بەریانی ئەم زانیاریانەی پێدام.

٩٧) شێخ ئەنوەر/ ناوی خۆی ئەنوەر ئیبراهیم ڕەشیدەو لە گەڕەکی گۆیژە لە سلێمانی ساڵی ١٩٣٣ لە دایك بووە.

٩٨) خوالێخۆش بوو مامۆستا عەبدوللا جەوهەر تۆفیق لە ساڵی ١٩٢٠ لە سلێمانی لە دایکبووەو لە ساڵی ١٩٨٢ ماڵئاوایی کردووە.

٩٩) چاوپێکەوتن لەگەڵ شێخ ئەنوەر ڕۆژی ٧/٩/١٩٩٧ گازینۆی شەعب.

١٠٠) نوری وەشتی/ ناوی نوری محەمەد ئەمین قادرەو لە ساڵی ١٩٣٥ لە گەڕەکی کانێسکان لە سلێمانی لە دایك بووە هەر لەوێشەوە خوێندنگای سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەیی بازرگانی تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٥٣ بەشیعرو پەخشان لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەوسادا (ژین‌و هەتاو پێشکەوتن) دەستی کردووە بەبلاوکردنەوەی بەرهەمەکانی، هەروەها چیرۆك نامەشی نووسیوە. وەك ڕۆژنامە نووسێك لە ڕۆژنامەکانی (ژین‌وو بەرواو گۆڤاری شارەوانی سلێمانی) کاری ڕۆژنامە نووسی کردوە لە ژیانی خوێندکاریدا چەندین جارگیراوەو دوورخراوەتەوە لە خوێندنگا. ساڵی ١٩٥٥ وەك ئەکتەرێکی سەرکەوتوو لە هەموو ئەو شانۆگەریانەدا کە نمایشی تیا کردووە دەوری سەرەکی تیا بینیوەو سەلیقە دار بووە تیایاندا، ساڵی ١٩٥٧ بۆتە فەرمانبەر لە شارەوانی سلێمانی. ئەندامێکی چالاکی دامەزرێنەری کۆمەڵی هونەرە جوانەکان) بوە ئێستا فەرمانبەرە لە شارەوانی بەشی ڕاگەیاندن.

١٠١) لە چاوپێکەوتنێکدا کە لە شارەوانی لەگەڵم کرد ڕۆژی ١/٤/١٩٩٩ پاشان ژیاننامەی خۆی بۆ ناردم بەبەرواری ٤/٤/ ١٩٩٩ .

١٠٢) نامەی بەرێز پرۆفیسۆر د. عزەدین مستەفا ڕەسوڵ لە ٢٦/٤/١٩٩٩.

١٠٣) نامەی برای ڕۆشنبیرو خۆشەویستم مامۆستا شێخ حسەین نێرگسە جاری لە ١٧/٥/١٩٩٩.

١٠٤) گۆڤاری بەیان/ ژمارە (٩٣) کانوونی یەکەم ساڵی ١٩٨٣ لاپەڕە (٨٤)
١٠٥) سەرچاوەی پێشوو.

# سەرچاوەکان


١- تێگەیشتنی راستی‌و شوێنی لە رۆژنامە نووسی کوردیدا/ د. کەمال مەزهەر ئەحمەد/ ١٩٧٨

٢- بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٩/ شوکر مەعروف بەرزنجی/ ١٩٧٨

٣- راپۆرتێك سەبارەت نامەخانەو دەستنووسەکان/ شێخ محەمەدی خاڵ/ رۆنیسۆ/ مێژووی لەسەر نییە.

٤- کۆمەڵی زانستی لە سلێمانی/ غەفوور میرزا کەریم/ ١٩٨٥

٥- رابەری رۆژنامەگەری کوردی/ جەمال خەزنەدار/ ١٩٧٣

٦- شاری سلێمانی/ بەرگی یەکەم/ ئەکرەم مەحموود ساڵح رەشە.

٧- سلێمانی شارە گەشاوەکەم/ بەرگی یەکەم/ جەمال بابان/ بەغداد/ ١٩٩٧

٨- رۆژی کورد (١٩١٣) /جەمال خەزنەدار/ ١٩٨١

٩- دیوانی ئەخۆل/ ئەخۆل/ ١٩٨٥

١٠- دیوانی کاکەی فەلاح /کاکەی فەلاح/١٩٨٠

١١- بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی/ مستەفا نەریمان/ ١٩٧٧

١٢- بیبلیۆگرافیای سەد ساڵ کتێبی کوردی/ مستەفا نەریمان/١٩٨٦

١٣- رۆژی کوردستان/ جەمال خەزنەدار/ ١٩٧٣

١٤- بانگی کوردستان/ جەمال خەزنەدار/ ١٩٧٤

١٥- چیرۆکی هونەری کوردی ١٩٢٥- ١٩٦٠/ حسەین عارف/ ١٩٧٧

١٦- تاریخ الصحافه الکردیه فی العراق/ جبار محمد جباری/١٩٧٥

١٧- گەشتی شارباژێڕ لە ساڵی ١٩٢٩/ شاکر فتاح/١٩٧٢

١٨- گەشتی پێنجوێن لە ساڵی ١٩٣٠/ شاکر فتاح/١٩٧٣

١٩- خەباتی رۆشنبیران (یاد نامەی ساڵی ١٩٣١/ شاکر فتاح/ ١٩٧٤

٢٠- گەشتی سرۆچك لە ساڵی ١٩٣٢/ شاکر فتاح/١٩٧٢

٢١- گەشتی هەڵەبجەو هەورامان لە ساڵی ١٩٣٣/ شاکر فتاح/ ١٩٧٣

٢٢- رۆژنامەی خورماڵ /١٩٤٠/ شاکر فتاح/ ١٩٨٣

٢٣- رۆژنامەی باسەرە/ ١٩٤٢/ شاکرفتاح/١٩٨٥

٢٤- گەشتی چەمچەماڵ/ ١٩٤٦/ شاکرفتاح/ ١٩٨٣
٢٥- رۆژنامەی ئاگرێ ١٩٥٠/ شاکرفتاح/ ١٩٨٤
٢٦- بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی/ ١٩٢٥-١٩٨٢/ حسین عارف/ ١٩٨٧

# رۆژنامەو گۆڤارەکان

١- رۆژنامەی پێشکەوتن هەموو ژمارەکانی .
٢- رۆژنامەی ژیان ژین،هاوکاری،ئاسۆ، هەرێمی کوردستان
٣- گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە-١١ ساڵی ٦/ تشرینی دووەم ١٩٤٥
٤- گۆڤاری هیوا ژمارە- ٩، ١٠ ساڵی دووەم نیسانو مایس ١٩٥٩
٥- گۆڤاری رۆژی نوێ ژمارە /١١/شوباتی ١٩٦١
٦- گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە/١٠٢/ تەموزی ١٩٨٤/ مەلا مەحمود ئەحمەد محەمەد.
٧- گۆڤاری رۆشنبیری نوێ /١١٠/حوزەیران ١٩٨٦ / لەتیف قەرەداغی.

# نامەکان

١- نامەی بەڕێز مامۆستا عومەر عەلی ئەمین٢٨/٢/١٩٩٩
٢- نامەی برای رۆژنامە نووس کاك هێرش محەمەد ئەمین لە ٢٤/٩/١٩٩٨
٣- نامەی بەڕێز هونەرمەند نوری وەشتی لە ٤/٤/١٩٩٩
٤-نامەی پرۆفیسۆر د.عزەدین مستەفا رەسوڵ ٢٤/٤/١٩٩٩

# چاوپێکەوتنەکان

١- بەڕێز عوسمان محەمەد نادر ٢٣/٦/١٩٩٧ ماڵی خۆیان سەر لە بەیانی
٢- شێخ ئەنوەر ئیبراهیم رەشید لە ٧/٩/١٩٩٧ گازینۆی شەعب.
٣- جەمال محەمەد ئەمین لە ٩/١٠/١٩٩٧ دوکانەکەی خۆی
٤-عوسمان محەمەد نادر لە ١٢/٤/١٩٩٨ ماڵی خۆیان سەر لەبەیانی.
٥- مامۆستا عومەر مەعروف بەرزنجی ١٨/١٠/١٩٩٨ گازینۆی شەعب

٦-مامۆستا حەمە بۆر(هۆشەنگ) ١٩٩٨/١١/٢٠ لە کتێبخانەی شوێنەواری سلێمانی.
٧- شادمان مەلا عەزیز مەلا عەلی صەحاف لە ١٥/ ١١/ ١٩٩٨ بازاڕی تازە
٨- محەمەد عارف مەعروف لە ١٩٩٨/١١/١٧ لە نووسینگەی خۆی شەقامی مەولەوی.
٩- محەمەد فەتاح لە ١٩٩٩/٢/١١ کتێبخانەی مەڵبەندی ڕێکخستن(ی. ن. ك)
١٠- شێخ بەکر شێخ عەزیز باراوی لە ١٩٩٨/١٢/٣٠ لە دوکانی خۆی.
١١- عومەر عەلی ئەمین ١٩٩٩/٢/١١ لە وەزارەتی ڕۆشنبیری.
١٢- برای ڕۆژنامە نووس بەڕێوەبەری کتێبخانەی سلێمانی، کاك یاسین قادر بەرزنجی لە ١٩٩٩/٢/٢١ کتێبخانەی گشتی سلێمانی
١٣- مامۆستا غەفور میرزا کەریم لە ١٩٩٩/٣/٢٥ ماڵی خۆیان سەرلەبەیانی.
١٤- هونەرمەند نوری وەشتی لە ١٩٩٩/٤/١ لە شارەوانی سلێمانی.
١٥- بەڕێز مەلا نوری عەزیز ماستاو لە ١٩٩٩/٤/٢٦ کتێبخانەکەی خۆی لە عەقاری.
١٦- بەڕێز ناجی خوشکی شەهید کەریمی سۆفی رۆژی ١٩٩٩/٥/٣ لە ماڵی خۆیان.

# مارف ناسراو

مارف کەریم سالّح (ناسراو) لە رۆژی ٢٣مارتی ١٩٤٣ لە گەرەکی کانێسکان لە سلێمانی لە دایك بووە لە سالّی ١٩٦٧ ناوەندی تەواو کردووە هەر لەو سالّەدا بوو بە کتێب فرۆش‌و لە سالّی ١٩٧١ بووبە ئەندامی کۆمەلّی هونەرو وێژەی کوردی لە سالّی ١٩٧٢ لە رۆژنامەی (ژین) کە مامۆستای کاکەی فەلاح دەری ئەکرد کاری ئەکرد هەر لەو سالّەدا لە بەغدا بوە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەلّ لقی بەغداد لە سالّی ١٩٧٤ لە رۆژنامەی هاوکاری کاری رۆژنامە نووسی ئەکرد هەر هەمان سالّ بو بە ئەندامی کارای سەندیکای رۆژنامە نووسانی عێراق لە ١٩٧٧ کۆمەلّە شیعری (سەرچنار)ی چاپ کرد سالّی ١٩٧٩ بوبە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد لقی سلێمانی ١٩٩٦/٣/٣٠ یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی رۆژنامەی هەرێمی کوردستان خولی دووەم لە ڤیستڤالّی (٩٩) یادی رۆژنامەگەری کوردیدا

شكۆنامەی وەزارەتی رۆشنبیری‌و بنكەی ئەدەبی گەلاوێژی پێ بەخشراوە سالی١٩٩٨ كۆمەڵە شیعری (رووبار كە بۆ دەریا ئەدوێ) ی چاپ‌و بلاوكردۆتەوە سالی ١٩٩٨ بۆ بە ئەندامی بنكەی ئەدەبی رووناكبیری گەلاوێژ لە یادی داگیرساندنی مۆمی سێ سالەی رۆژنامەی هەرێمی كوردستاندا (رێزنامە)ی وەزارەتی رۆشنبیری پێبەخشراوە. ئێستا لە رۆژنامەی هەرێمی كودستان‌و رۆژانەی سلێمانی وەك رۆژنامە نووس كار دەكات. لە حەفتاكانەوە لە زوربەی رۆژنامەو گۆڤارەكان ووتاروو شیعرو نووسینی بلاو كردۆتەوە.

## ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی وەزارەتی رۆشنبیری لە ساڵی ١٩٩٩ داچاپی کردوون و هاوکاری کردوون

| ژ | ناوی کتێب | ناوی خاوەن کتێب | جۆری کتێب | جۆری [illegible] |
|---|---|---|---|---|
| ١ | سێدارەکانی بەهەشت | قوبادی جەلی زادە | هۆنراوە | چاپکر |
| ٢ | کورژنی خوێن | غەفور ساڵح | رۆمان | چاپکر |
| ٣ | مەرگی سوشاب | عەلی کەریم | شانۆیی | چاپکر |
| ٤ | بەسەرهاتی کەڵەپیاوێك | وەرگێرانی حسین عوسمان نێرگزەجاری | رۆمان | چاپکر |
| ٥ | مێژووی هۆزی جاف | حەسەن فەهمی جاف | مێژوویی | چاپکر |
| ٦ | ژوورەکەی دەلیا | ئاکۆ کەریم مەعروف | کورتە چیرۆك | چاپکر |
| ٧ | سەرەتایەکی زمان ناسی | میدیا | زمانەوانی | چاپکر |
| ٨ | بیلۆگرافیای کورد وکوردستان | ئەکرەم قەرەداخی | رۆژنامەگەری | چاپکر |
| ٩ | کورد | و . د. عیزەدین مستەفا رەسول | مێژوویی | چاپکر |
| ١٠ | نامیلکەی چالاکیەکانی وەزارەتی رۆشنبیری بۆ ساڵی ١٩٩٩ | ئامادەکردنی فەرید زامدار | رۆژنامەگەری | چاپکر |
| ١١ | حەپسەخانی نەقیب | پەخشان جەلال حەفید | مێژوویی | چاپکر |
| ١٢ | وتنەوەی بیرکاری پۆلی یەکەم و دووەمی سەرەتایی | عەلی ئەحمەد | زانستی پەروەردەیی | چاپکر |
| ١٣ | ئینسکلۆپیدیای کیمیا | جەمال عەبدول | زانستی | چاپکر |
| ١٤ | کورتەجوگرافیای کوردستان | کەریم زەند | جوگرافیا | چاپکر |
| ١٥ | بەفرە فریوەکان چین لەکوێوە هاتوون | ساڵح محەمەد | زانستی | چاپکر |
| ١٦ | مردووەکان بنێژن | و.یاسین بەرزنجی | شانۆگەری | چاپکر |
| ١٧ | میرزا مارف | ئومێد ئاشنا | ژیان و بەرهەمەکانی | چاپکر |
| ١٨ | هاواری دل | بولر نورەدین | مەزهەری خالقی | چاپکر |
| ٢٠ | بابەتەکانی پەروەردەی نوێ | فواد قەرەداخی | پەروەردەیی | هاوکا |
| ٢٠ | وینەکەی خوشکت | رۆوف حسن | کورتە چیرۆك | چاپ ک |
| ٢١ | کلوە بەفرەکانی خۆر | هوشیار بەرزنجی | هۆنراوە | یارمە |
| ٢٢ | گوناهەکانی بەفرو سیبەر | محەمەد کاکە رەش | هۆنراوە | چاپ ک |
| ٢٣ | گوێرایەلی بۆ ئامۆژگاریەکانی دایەو بابە | و. حەسەن عبدالکریم خانەی مندالان ب.گ.رۆشنبیری و هونەر | چیرۆکی مندالان | چاپ ک |
| ٢٤ | گوی دریژ و پاشا | و.لەتیف هەلمەت خانەی مندالان ب.گ.رۆشنبیری و هونەر | چیرۆکی مندالان | چاپ ک |
| ٢٥ | [illegible] | [illegible] | چیرۆکی مندالان | چاپ ک |

| ژ | ناوی کتێب | ناوی خاوەن کتێب | جۆری کتێب | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| | | ب.گ.رۆشنبیری و هونەر | | |
| ٢٦ | گێژاوی پۆڵەندە | و.بورهان قانع | مێژوویی | چاپکردن |
| ٢٧ | گۆڤاری دایەلۆك | ژمارە(٤) ی گۆڤار | ڕۆژنامەگەری | هاوکاری |
| ٢٨ | گۆڤاری شانۆ | ژمارە(٩) ی گۆڤار | ڕۆژنامەگەری | هاوکاری |
| ٢٩ | گۆڤاری ئاران | گۆڤار | ڕۆژنامەگەری | هاوکاری |
| ٣ | دیاریەك بۆ یادی سەدویەك ساڵەی ڕۆژنامەگەری کورد | ئامادەکردنی ئومید ئاشنا | ڕۆژنامەگەری | هاوکاری |
| ٣ | کۆمەڵزانیو کورد | فؤاد طاهر صادق | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| ٣ | باخچە ڕەژووەکانی حەقیقەت | شازین هیرش | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٣ | ئاوییەر | صدیق بۆرەکەیی | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٣ | هەناسەیەك لە تەنهاییدا | بەناز کویستانی | پەخشان | چاپکردن |
| ٣ | دیوانی ڕەمزی مەلا مارف | ڕەمزی مەلا مارف | هۆنراوە | چاپکردن |
| ٣ | حەپسەخانی نەقیب لە ئاوێنەی مێژوودا | رؤوف عثمان | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣ | چارە نووس | گرد عازەبانی * | ڕۆمان | چاپکردن |
| ٣ | مدن کوردیة قدیمة | مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣ | خۆزگەکانی بەرد هەڵکەنیك | وەرگێرانی نوری سعید قادر ب . ڕۆشنبیری وهونەر | چیرۆکی منالآن | چاپکردن |

## ئەوکتێب و بڵاوکراوانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری لە ساڵی ٢٠٠٠ دا چاپی کردوون و هاوکاری کردوون

| | ناوی کتێب | ناوی خاوەن کتێب | جۆری کتێب | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| | مناڵ و شیعر | محمد کەساس | هۆنراوە | چاپکردن |
| | ڕۆژنامەگەری | و . مجید صالح | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| | ئافرەت لەمۆسیقاو گۆرانی کوردیدا | سەردار خدر حسین | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| | ئۆزدەمیرۆکورد | ئەحمەد باوەر | مێژوویی | چاپکردن |
| | دەچل نێرگز | محمد رحیم رمضان | چیرۆك | چاپکردن |
| | مێژووی کتێبخانەکانی سلێمانی | مارف ئاسراو | مێژوویی | چاپکردن |
| | شایەت | و ، ئاشتی عوسمان دانش | شانۆیی | چاپکردن |
| | هەڵتەبزانی | و . شێرزاد حسن | ڕۆژنامەگەری | چاپکردن |
| | چەند گیروگرفت ودیمەنێکی دەروونی | و . جلال خلف | زانستی | چاپکردن |
| | فەرهەنگی زەوی زانی وێنەدار | کمال جلال غریب | زانستی | چاپکردن |
| | لەبارنەی شانۆدا | عەلی کەریم | شانۆیی | چاپکردن |
| | بووژاندنەوەی ڕۆشنبیری ونەتەوەیی‌یکورد | و . صدیق صالح | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| | چەند بابەتێك دەربارەی کەلتووری نەتەوەی کورد | سەلام مەنمی | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| | مەرگی وەنەوشە | یاسین قادر بەرزنجی | چیرۆکی | هاوکاری |